یەکێك لە پرفرۆشترین بەرهەمەکانی نووسەر لە جیهاندا

# ڕێگایەکی خێرا و ئاسان بۆ قسەکردن بە شێوەیەکی کاریگەر







نووسینی:
دەیل کارنگی

وەرگێڕانی:
سەروەر نامیق

**پێناسی کتێب:**

ناوی کتێب: ڕێگایەکی خێرا و ئاسان بۆ قسەکردن بە شێوەیەکی کاریگەر

نووسەر: دەیڵ کارنگی

وەرگێڕان: سەروەر نامیق

بابەت گەشەپێدانی مرۆیی

تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦١٥)

ی ساڵی ٢٠٢٠ ی پێدراوە

# پێڕست

# پێشەکی

دەیل کارنگی لە ساڵی ١٩١٢ دەستی کردووە بە یەکەم خولی فێرکاری تایبەت بە ووتاربێژی و قسەکردن بۆ خەڵك. لەو سەردەمەدا ووتاربێژی و قسەکردن وەك هونەرێك تەماشا دەکرا نەك جۆرێك لە توانا و کارامەیی، لەبەر ئەوە ئامانجی خولەکانی تەنها ئەوەبوو قسەکەر و کەسانی کارامە و زمان پاراو پێبگەیەنن. گەر کەسێکی ئاسایی خاوەن پیشە یان هەر کەسێکی دیکە بیویستایە فێری قسەکردن بێت و بتوانێت بەئاسانی گوزارشت لە ناخی خۆی بکات و ئاستی بڕابەخۆبوونی زیاد بکات، نەدەهات کات و پارەیەکی زۆر بەسەر ببات بە خوێندن و هەوڵ بدات خۆی فێری چۆنێتی قسەکردن، ڕاهێنان لەسەر دەنگ، یاساکانی ڕەوانبێژی، یان زمانی جەستە بکات، ئەم کەسە بێ دوودڵی بەشداری خولەکانی دەیل کارنگی دەکرد، چونکە هەموو ئەوەی ئەو دەیویست لەو خولەدا دەستی دەکەوت.

لەمڕۆدا خول و ڕاهێنانەکانی دەیل کارنگی بە هەموو جیهاندا بڵاو بوونەتەوە و بە هەزاران فێرخواز لە خانمان و لە پیاوان لە شوێنە جیاوازەکانەوە گەواهی بۆ سەرکەوتوویی بیرۆکە و تەکنیکەکانی دەدەن، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە بەسەرکەوتوویی توانیویانە توانای قسەکردنیان بەرەوپێش ببەن و کەسایەتی خۆیان بەهێز کردووە.

ئەو کتێبەی دەیل کارنگی نووسی بۆ ئەوەی لە خولەکانیدا وەك پەیڕەو (منهج) بخوێنرێت، زیاتر لە ٥٠ هەزار دانەی لێ چاپکرا، بۆ یانزە زمان وەرگێردرا، وە چەند جارێکیش دەیل کارنگی خۆی پێداچوونەوەی بۆ

کردبوو بۆ ئەوەی بەردەوام زانیاری و ئەزموونی نوێی بۆ زیاد بکات. ساڵانە ڕێژەیەکی زۆر خەڵکی کتێبەکەیان دەکڕی و بەردەوام ڕێژەکەش لە زیادبووندا بوو.

چاپی چوارەمی کتێبەکە لەسەر بنەمای تێبینی و بیرۆکەکانی مێردەکەم خۆی دارێژرابوویەوە. ناونیشانەکەش خۆی پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات هەڵیبژارد. دوای وەفاتیشی هەموو کات هەوڵم داوە فەلسەفەی مێردەکەم لە مێشکی خۆمدا هەڵبگرم: قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر هەر ئەوە نییە "هەندێك وشە بە گوێگرەکانت بڵێیت." بابەتەکە پەیوەندی بە دەربڕین و قسەی بەهێز و سەرنجڕاکێشەوە هەیە.

هەموو کار و چالاکییەکی ڕۆژانە جۆرێکە لە پەیوەندی و ئاخاوتن، بەڵام تەنها بەهۆی قسەکردنەوە مرۆڤ دەتوانێت گوزارشت لە ناخی خۆی بکات. تەنها مرۆڤە لەناو هەموو بوونەوەرانی دیکەدا ئەو بەخششەی پێدراوە و دەتوانێت گفتوگۆی زارەکی بکات، هەروەها بەهۆی تایبەتمەندیی قسەکانییەوە دەتوانێت کەسایەتی و ناخی خۆی دەربخات. بۆیە کاتێك ئەم کەسە ناتوانێت ئەوەی مەبەستێتی بەڕوونی بیڵێت، دەبینیت کەسایەتیی و ناخی بەداخراوی دەمێننەوە و گوێگر ناتوانێت بەباشی لێی تێبگات.

کاتێك کەسێك دەتوانێت بەڕوونی گفتوگۆ بکات و قسە بۆ هاوڕێ و هاوپیشەکانی بکات، باس لەوە بکات حەزی لە چییە و بڕوای بە چییە، ئەوکات هەست بە ئاسوودەیی و متمانەبەخۆبوون دەکات. بۆیە ئێستا کە ترس، نائارامی، و پشێوییەکان جیهانیان داگیرکردووە، زیاتر پێویستمان بەوەیە توانای قسەکردنمان باشتر بکەین. هیوام وایە ئەم کتێبە لەو

ڕووانـەوە سـوودی تـەواوەتی هـەبێت، هـەم بـۆ ئەوانـەی دەیانـەوێت بەڕوابەخۆبوونیان زیاتر بکەن و پەرە بە تواناکانیان بدەن، هەم بۆ ئەوانەشی کە حەز دەکەن بتوانن باشتر و ڕوونتر گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن.

دۆرۆسی کارنگی

# TANYA HAJI | تەنیاحاجی



چەناڵی تەنیاحاجی لە تیلیگرام
گەورەترین چەناڵی کتێب و
پەروەردەی و تەندرووستی و
سیمینار و ڕۆشنبیری و
گەشەپێدان



tanyahaji7





# بەندی یەکەم



## بنەماگانی قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر

لە هەر هونەرێکدا چەند بنەما و تەکنیکێك هەن.

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا، باس لە بنەماکانی قسەکردنی کاریگەر و شێوازی بیرکردنەوە دەکەین بۆ ئەوەی بتوانین بەتەواوی ئەو بنەمایانە بەرجەستە بکەین و ڕوونیان بکەینەوە.

ئێمە وەك تازەپێگەشتووان، زۆر حەزمان لە ڕێگایەکی خێرا و ئاسانە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کاریگەر قسە بۆ بەرانبەر بکەین. تاکە ڕێگاش کە بتوانین بەخێرایی دەرئەنجامەکانمان دەست بکەوێت و سوودمەند بین ئەوەیە، کە بیرکردنەوەیەکی دروستمان هەبێت لە گەشتن بە ئامانجەکەمان، هەروەها لەو بنەمایانەی ئێستا باسیان دەکەین بناغەیەکی پتەومان هەبێت تاوەکوو بتوانین خۆمانی لەسەر بنیات بنێین.

## ((بەشی یەکەم))
## فێربوونی توانا سەرەتاییەکان

---

لە ساڵی ١٩١٢دا دەستمکرد بە وتنەوەی کۆرسی جۆربەجۆر تایبەت بە شێوازی ووتاردان و قسەکردن بۆ خەڵکی، ڕێك ئەو ساڵە بوو کە کەشتی تایتانیك لە زەریای ئەتڵەسیدا نقووم بوو. لەوکاتە بەدواوە تا ئێستا، زیاتر ٧٥٠ هەزار کەس لەو کۆرسانەدا تەخەڕوجیان کردووە.

هەموو جارێك لە سەرەتای کۆرسەکەدا ئامادەبووان دەرفەتیان پێدەدرا بۆ ئەوەی پێمان بڵێن هۆکار چی بوو ناوی خۆیان تۆمار کرد، وە دەیانەوێت لەم کۆرسەوە چییان دەست بکەوێت. بەشێوەیەکی سروشتی وەڵامەکان چەند دەستەواژەیەکی جۆربەجۆر بوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی هەرەزۆری داخوازییەکان لەدەوری یەك شتدا کۆدەبوونەوە: "کاتێك داوام لێ دەکرێت قسە بکەم، زۆر تەریق دەبمەوە، زۆر دەترسم، بەجۆرێك کە ناتوانم بەباشی بیر بکەمەوە، تەرکیزم دەپچڕێت، لەبیرم نامێنێت دەمویست بڵێم چی. دەمەوێت متمانەم بەخۆم هەبێت، هاوسەنگ بم، هەروەها بتوانم لەسەر پێیەکانم ڕابووەستم و بەڕوونی بیر بکەمەوە. دەمەوێت بیرکردنەوەکانم بەشێوەیەکی لۆژیکی پێکەوە گرێ بدەم، هەروەها بتوانم لەبەردەم کۆمەڵێك کەسی پیشەیی یان کۆمەڵایەتیدا بەڕوونی قسە بکەم و بتوانم قایلیان بکەم."

ئایا هەست ناکەیت ئەم کێشەیە شتێکی باوە؟ ئایا تۆش هەمان ئەو هەستانەت ئەزموون نەکردووە؟ ئایا ئامادە نیت پارەیەکی کەم بدەیت بۆ

ئەوەی وات لێبێت بتوانیت بەشێوەیەکی قایلکەر قسە بۆ خەڵکی بکەیت؟ دڵنیام ئامادەیت. خۆی لە خۆیدا ئێستا کە خەریکی خوێندنەوەی ئەم لاپەڕانەیت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حەزت لێیە ئەو توانایە بەدەست بهێنیت و بتوانیت قسە بۆ خەڵکی بکەیت.

دەزانم دەتەوێت چی بڵێیت، دەزانم گەر بتوانیبا قسە بۆ من بکەیت دەتگووت: "بەڵام بەڕێز کارنگی، ئایا بەڕاست پێت وایە دەتوانم ئەوەندە متمانە بە خۆم دروست بکەم کە بتوانم لەسەر پێ ڕاوەستم و ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کەس بووەستم و بەشێوەیەکی کارامە و پاراو قسە بکەم؟"

من هەموو تەمەنم لەوەدا بەسەربردووە یارمەتی خەڵکی بدەم لە ترس ڕزگاریان بێت و متمانە و بوێریی پەیدا بکەن. ئەوەندە چیرۆک و بەسەرهاتی سەیر سەیرم لایە هی ئەو کەسانەی کە لە کۆرسەکانمدا بەشدارییان کردووە، دەتوانم چەندین کتێبیان لەسەر بنووسم. بۆیە ئەوە تەنها پرسارێک نییە کە بە مێشکی خۆم دامڕشتبێت. بۆیە من دڵنیام ئەگەر ئەو ڕێنماییانەی لەم کتێبەدا باسکراوە پیادەیان بکەیت، تۆش دەتوانیت ئەوە بیت کە خۆت دەتەوێت.

ئایا هیچ هۆکارێک هەیە کە ناتوانیت بەپێوە بەرانبەر کۆمەڵێک کەس بیربکەیتەوە و قسە بکەیت، لەکاتێکدا بەدانیشتوویی دەتوانیت؟ ئایا هیچ هۆکارێک هەیە کە ناتوانیت ئەو ترپەترپەی ناوسکت کۆنترۆڵ بکەیت و کاتێک لەبەردەم کۆمەڵە کەسێکدا دەوەستیت و قسەیان بۆ دەکەیت، وەک درەخت دەلەرزیت؟ بێگومان بۆت دەردەکەوێت ئەو جۆرە حاڵەتە چارەسەری هەیە، تێدەگەیت کە چۆن مەشق و ڕاهێنان ترست ناهێڵێت و متمانەت بەخۆت زیاد دەکات.

ئەم کتێبە یارمەتیت دەدات ئەو ئامانجە بەدەست بهێنیت. ئەم کتێبە هەروا شتێکی سادە و ئاسایی نییە. پڕ نەکراوە لە کەمەڵێك یاسای تایبەت بە شێوازی قسەکردنەوە. نەهاتووە قسە بکات لەسەر لایەنە دەروونیەکانی گفتوگۆکردن. بەڵکوو پوختە و کۆکراوەی ئەو چەندین ساڵەیە کە لەبارەی قسەکردنێکی کاریگەرەوە مەشق و ڕاهێنانم بە گەنجان کردووە. ئەم کتێبە لە ئێستای تۆوە دەستپێدەکات بۆ ئەو شوێنەی کە دەتەوێت پێی بگەیت. هەموو ئەوەی لەسەر تۆیە ئەنجامی بدەیت ئەوەیە کە شوێن پێشنیارەکانی بکەویت، لە هەموو گفتوگۆکانتدا پیادەیان بکەیت، و لە ژیانی خۆتدا درێژەیان پێ بدەیت.

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی خێرا و کاریگەر زۆرترین سوود لەم کتێبە وەربگریت، شوێن ئەم چوار ڕێبەرییە بکەوە سوودی زۆرت پێ دەگەیەنن:

## یەکەم/ سوود لە ئەزموونی کەسانی دیکە وەربگرە

هیچ بوونەوەرێك نییە کە لەگەڵ لەدایکبوونیدا توانای ووتاردانی هەبێت بۆ خەڵك. بەتایبەت لە مێژوودا و لەو سەردەمانەی کە ووتاردان هونەرێکی سەرنڕاکێش بووە و پێویستی بە ڕەوانبێژییەکی ورد و توانایەکی زۆری گەیاندن هەبوو. لە ئێستادا ئێمە وەك گفتوگۆیەکی فراوانتر لە ووتاردان دەڕوانین.

هەموو دەق و نووسراوەکان هەوڵدەدەن براومان پێ بهێنن کە ووتاردان و قسەکردن بۆ خەڵك هونەرێکی داخراو نییە و دوای سێ ساڵ لە ڕێکخستنی دەنگ و هەوڵدان بۆ فێربوونی ڕەوانبێژی دەتوانین ببینە ووتاربێژێکی سەرکەوتوو. منیش وەك خۆم زۆربەی هەرە زۆری سیمینار و فێرکارییەکانم ئەوەبووە خەڵکی تێبگەیەنم ووتاردان شتێکی ئاسانە،

بەو مەرجەی شوێن هەندێك یاسای سادە، بەڵام گرنگ بکەون. کاتێك لەساڵی ١٩١٢ لە نیویۆرك دەستمکرد بە وانەوتنەوە، لەڕاستیدا منیش هەر ئەوەندەی ئەو خوێندکارانەم لێ دەزانی کە وانەم پێ دەوتنەوە. خۆم لە زانکۆ چۆن فێرکرابووم بەو شێوەیەش ئەوانم فێردەکرد، بەڵام بەزوویی بۆم دەرکەوت لەسەر ڕێگایەکی هەڵەم: تەنها هەوڵم دەدا وەك خوێندکارێکی قۆناغی یەکەمی زانکۆ ئەندامانی خولەکەم فێری بازرگانی و بازاڕگەری بکەم. ئەوەبوو هەستم بەوە کرد هیچ سوودێك لەوەدا نییە کەسانی دیکە وەك نموونە بهێنمەوە و ئەمانیش چاویان لێ بکەن. ئەوەی ئەندامانی کۆرسەکەم دەیانویست ئەوەبوو کە بوێریی و ئازایەتی ئەوەیان هەبێت لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن و بەڕوونی و بەڕێکی باس لە چاوپێکەوتن و بەرنامەی داهاتوویان بۆ کارمەند و ئامادەبووان بکەن. ئەوەبوو ئەو کتێبەی وانەم تێدا دەگووتەوە لە پەنجەرەکەوە هەتا هێزم تیچدابوو فرێم دایە دەرەوە، هەستامە سەر دووانگەکە (مەنەص) و بە هەندێك بیرۆکەی سادەوە هەوڵم لەگەڵ بەشداربووەکانمدا دەدا و شتی نوێم فێردەکردن تا وایان لێهات توانیان بەشێوەیەکی جوان ڕاپۆرت و بابەتەکانیان پێشکەش بکەن. ئەو کارەم زۆر سوودی هەبوو چونکە دوای ئەو خولە بەردەوام دەهاتن بۆ خولی زیاتر و زیاتر.

خۆزگە بمتوانیبا ئەو گواهی و سوپاینامانەت پیشان بدەم کە لە ماڵەوە و لە ئۆفیسی نوێنەرەکانم لە سەرانسەری جیهاندا هەڵمگرتوون. هەموو ئەو نامە و نوسراوانەم لەلایەن ئەو کەسانەوە بۆ دەهات کە بەردەوام لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز و واڵ ستریتدا ناویان دەهێنریت و باس دەکرێن، لەو کەسانەوە سوپاسنامەم بۆ دەهات کە پارێزگار یان

ئەندام پەرلەمان بوون، هەروەها لە کەسە بەناوبانگەکانی سەر شاشە و نێو فیلم و سینەماکانەوە سوپاسنامە و دەستخۆشیم بۆ هاتووە. هەزارەها ژنی ماڵ، مامۆستا، کوڕ و کچی گەنج ، کرێکاران بە کارامە و ناکارامەکانەوە، ئەندام پەرلەمان، وەزیر، خوێندکارانی زانکۆ، لەگەڵ کەسانی بازرگان (بەتایبەت ئافرەتان) بوونیان هەیە. هەرهەموویان هەستیان کردبوو پێویستیان بە بڕوابەخۆبوونە و پێویستیان بەوەیە بتوانن بەشێوەیەکی گونجاو گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن. ئەم کەسانە زۆر سوپاسگوزاربوون کە توانیان لە خولەکانی ئێمەدا هەردوو پێویستییەکەیان پڕبکەنەوە: بڕوایان بەخۆیان بۆ دروست بێت و توانای ڕادەربڕینیان بۆ پەیدابێت. هەروەها خۆشحاڵ بوون کە توانییان نامەی سوپاس و پێزانینم بۆ بنووسن.

یەکێك لەو هەزاران کەسەی فێرم کردبوو، کەسێکە کە لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا دەهاتەوە یادم، ئەمیش لەبەر ئەو کاریگەرییە گەورەیەی دروستی کرد لەسەرم. چەند ساڵێك لەمەوبەر، ماوەیەکی کەم لەدوای ئەوەی بەشداری خولەکەمی کرد، دکتۆر گێنت کە بازرگانێکی سەرکەوتووی شاری فیلەدێلفیای ویلایەتی پەنسیلڤانیا بوو، بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتی کردم. خۆی بەسەر مێزەکەدا لارکردەوە و وتی: "بەڕێز کارنگی، پێشتر دەرفەتی زۆرم بۆ دەڕەخسا قسە بۆ خەڵکی بکەم، هەموویانم فەرامۆش دەکرد، بەڵام ئێستا بەناچاری سەرۆکی کۆمەڵەیەکم لە کۆمپانیادا، دەبێت سەرۆکایەتی هەموو کۆبوونەوەکان بکەم. ئایا بەڕای تۆ دەتوانم لەم کاتە درەنگەی تەمەنمدا فێری ئەوە ببم قسەیان بۆ بکەم؟"

لەسەر بنەمای ئەو ئەزموونەی لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەمە کە هەمان کێشەی ئەویان هەبوو و بەشداری خوولەکەمیان کردبوو، دڵنیام کردەوە و پێم گووت کە هیچ گوومانم لەوە نییە دەتوانێت ئامانجەکەی بەدەست بهێنێت و سەرکەوتوو دەبێت.

نزیکەی سێ ساڵ دواتر بەڕێکەوت جارێکی دیکە یەکترمان بینی. لە هەمان شوێن و لە هەمان مێز نانمان خوارد کە یەکەمجار نانمان لێ خواردبوو. گفتوگۆکەی ئەوکاتەم وەبیرهێنایەوە، پرسیارم لێکرد تاوەکوو بزانم پێشبینییەکەم ڕاست دەرچووە. بزەیەکی کرد و تیانوسێکی بچووکی بەرگ سووری لە گیرفانی دەرهێنا، لیستێك ناوی کۆبوونەوە و ووتاردانی پیشان دام کە بەنیازە لە چەند مانگی داهاتوودا پێشکەشیان بکات. وتی: "کاتێك دەتوانم قسە بکەم، ئەو خۆشییەی لە قسەکردن بۆ خەڵکی دەیبینم، ئەو خزمەتەی دەتوانم بیکەم ــ هەموو ئەمانە لە خۆشترین شتەکانی ژیانمن."

بەڵام ئەوە هەمووی نەبوو. بە هەستێکی پڕ لە شانازییەوە، دکتۆر گێنت تۆپەکەی خستە گۆڕەپانی خۆیەوە. سەرۆك وەزیرانی ئینگیلتەرا بانگهێشت کرابوو بۆ ئەوەی بەشداربێت لە ڕێوڕەسمی بەڕێوەچوونی ئاهەنگی دەرچووانی زانکۆ لە شاری فیلەدێلفیا. بەڕێوبەرانی ئاهەنگەکە بڕیاریان دا کەسێکی دیار و ناسراو دەستیشان بکە بۆ ئەوەی دەسپێکی ئاهەنگەکە پێشکەش بکات، ئەوکەسەش د. گێنت بوو.

ئەوە ئەو پیاوە بوو کە کەمتر لە سێ ساڵ لەمەوبەر لەسەر مێزی نانخواردنەکەدا خۆی بەلای مندا لارکردەوە و پرسیاری لێکردم بۆ ئەوەی

بزانێت هیچ کاتێك دەتوانێت بۆ ڕای گشتی قسە بکات و ووتار پێشەش بکات.

با نموونەیەکی دیکەت پێت بڵێم کە زۆر سەرنجڕاکێشە. کەسێك بەناوی دەیڤد ئێم گودریچ، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کارگێڕی کۆمپانیای بی ئێف گودریچ، ڕۆژێکیان هات بۆ ئۆفیسەکەم و وتی: "بە هەموو تەمەنم نەمتوانیوە بەبێ ترس قسە بۆ کۆمەڵە کەسێك بکەم. من، وەك سەرۆکی ئەنجومەنی کاگێڕی کۆمپانیا، دەبێت لە هەموو کۆبوونەوەکاندا ئامادەبم و سەرپەرشتییان بکەم. چەندین ساڵە هەموو ئەندامانی ئەنجوومەن دەناسم، کاتێك لەدەوری مێز کۆدەبینەوە هیچ کێشەم نییە و قسەیان بۆ دەکەم. بەلاّم ئەوکاتەی بۆ قسەکردن هەڵدەستمە سەر پێ، خەریکە لەترسا شەق ببەم. بەئەستەم دتوانم وشەیەك بڵێم. چەندین ساڵە بەو شێوەیەم. بڕوا ناکەم بتوانیت هیچم بۆ بکەیت. کێشەی من زۆر گەورەیە. زۆر لەمێژە پێیەوە دەناڵێنم."
منیش وتم، "زۆر باشە، ئەگەر پێتوایە ناتوانم هیچت بۆ بکەم، ئیتر بۆچی هاتوویت بۆلام؟"

وەڵامی دامەوە، "تەنها لەبەر یەك شت هاتووم، ژمێریارێکم هەیە کە کاری ژمێریاریی تایبەتیم بۆ دەکات. پیاوێکی زۆر شەرمنە، هەموو کاتێك بۆ ئەوەی بچێت بۆ ژووره بچکۆلانەکەی خۆی، دەبێت بەناو ژوورەکەی مندا بڕوات. ئەوە چەندین ساڵە کە دەچێتە ژوورەکەی خۆی، بەخێرایی دەڕوات و تەماشای زەوییەکە دەکات، بەدەگمەن قسەش دەکات، بەلاّم دەبینم بەم دواییانە گۆڕاوە. دێتە ژوورەکەم و سەری بەرزدەکاتەوە، چاوی دەدرەوشێتەوە، ئەنجا بە ڕۆحێتێکی بەرز و متمانەیەکی

بەهێزەوە دەڵێت: بەیانیت باش بەڕێز گودریچ. بەو گۆڕانکارییە زۆر سەرسام بووم. پێم وت: ئەوە کێ گۆشتی پێداویت؟ وتی کە لە خولێکی تۆدا بەشداری کردووە، بۆیە لەبەر ئەوەیە هاتووم چاوم پێت بکەوێت.“ منیش بە بەڕێز گودریچم گووت ئەو کەسەی ئەو باسی دەکات دەهات بۆ خولەکەم و ئەوەی پێمان دەگووت جێبەجێی دەکرد، لەماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا قسەی بۆ خەڵك دەکرد.

وەڵامی دامەوە، “ئەگەر تۆ بتوانیت ئەوە بکەیت، دەبم بە خۆشبەختترین پیاوی ئەم وڵاتە.“

ئەوەبوو بەشداری خولەکەمی کرد و بەرەوپێشوونێکی زۆر ناوازەی بەخۆیەوە بینی. ئەنجا دوای سێ مانگ بانگهێشتم کرد بۆ ئەوەی بێت بۆ هۆڵێکی گەورە و لەبارەی ئەوەی لە ڕاهێنان و خولەکانمانەوە بەدەستی هێناوە قسە بۆ سێ هەزار ئامادەبوو بکات. داوای لێبووردنی کرد و وتی ناتوانم بێم ـــ دەچم بۆ ئاهەنگی مارەبڕین. ڕۆژی دواتر تەلەفونی بۆ کردم، وتی، “ داوای لێبووردنت لێ دەکەم، ئەوە ئاهەنگەکەم هەڵوەشاندەوە و ناچم. دێم و لەبەرخاتری تۆ قسە دەکەم، من قەرزاری تۆم. بەو هیوایەی بەسەرهاتی من ئیلهام بە هەندێك لە گوێگران ببەخشێت و لەو ترسە ڕزگاریان بێت کە ژیانیانی وێران کردووە.“

داوام لێکرد تەنها بۆ دوو خوولەك قسە بکات. کەچی ئەو بۆ ماوەی یانزە خوولەك قسەی بۆ سێ هەزار کەس کرد. بەهەزاران موعجیزم دەبینی لەو خولەدا ڕوویان دا. چەندین ژن و پیاوم بینی بەهۆی ئەو ماوە کەمەوە ژیانیان گۆڕانکاری بەسەردا هات، زۆربەیان زۆر زیاتر لەوەی خەونیان پێوە دەبینی لە پیشە و بازرگانییەکەیاندا پلەیان بەرزکرایەوە، لەناو

کۆمەڵگەشدا پێگەیان زۆر بەرزبوویەوە. هەندێ جار گۆڕانکاری گەورەی لەم شێوەیە تەنها بەهۆی یەك قسەکردنەوە ڕوودەدات کە لەکاتی گونجاودا دەکرێت. گوێم لێ بگرە با چیرۆکی ماریۆ لازۆت بۆ بگێڕمەوە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر، لە کوباوە نامەیەکم بەدەست گەیشت کە زۆر سەرسامی کردم. نوسرابوو: "ئەگەر وەڵامم نەدەیتەوە، خۆم دێم بۆ نیویۆرك و بەشداری خوولەکانت دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم قسە بۆ خەڵك بکەم." لە خوارەوە بەناوی "ماریۆ لازۆ" واژۆ کرابوو. لەخۆمم پرسی! ئەمە کێیە؟ تا ئێستا نە نامە نە هیچ شتێکم لەم کەسەوە بۆ نەهاتووە.

کاتێك بەڕێز لازۆ گەشتە نیویۆرك، وتی: "یانەی وەرزشی هاڤانا دەیانەوێت ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی بەڕێوبەری یانەکەیان بگێڕن، منیش بانگهێشت کراوم بۆ ئەوەی کاسێکی زیوی پێشکەش بکەم و وتەی پێشەکی بڵێم بکەم. سەرباری ئەوەش، من پارێزەرم بەڵام تا ئێستا لەبەرچاوی خەڵك قسەم نەکردووە، زۆر لە قسەکردن دەترسم. ئەگەر بێتو لەو قسەکردنەدا شکست بهێنم و باش نەبم، هاوسەرەکەم زۆر شەرمەزار دەبێت و خۆیشم لە کۆمەڵگەدا زۆر پێی دەشکێم. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە ڕێز و شکۆم لای ئەو کەسانە نەمێنێت کە کاری پارێزەرییان بۆ دەکەم. لەبەر ئەوەیە لە کوباوە هاتووم بۆ لات بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەیت. تەنها سێ هەفتە دەتوانم بمێنمەوە."

لە ماوەی ئەو سێ هەفتەدا، ماریۆ لازۆ لەم پۆلەوە دەچووە ئەو پۆلەکە و شەوانە سێ بۆ چوار جار قسەی بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە بەشداری خوولەکە بوون. دوای سێ هەفتە، ئەوەبوو لە یانەی هاڤانا قسەی بۆ کۆمەڵێك کەسی ناودار کرد. قسەکردنەکەی ئەوەندە سەرنجڕاکێشبوو کە

ڕۆژنامەی "تایم مەگەزین" وەك هەواڵێکی جیهانی باسی کرد و بەسەردێڕێکی گەورە ناوی ماریۆ لازۆی وەك "ووتاربێژێکی ئەفسانەیی" نوسیبوو.

لە موعجیزە دەچێت، وانییە؟ بەڵێ، موعجیزەیە ـ موعجیزەی سەدەی بیستەم بۆ زاڵبوون بەسەر ترسدا.

**دووەم/ ئامانجەکەت لەپێش خۆتەوە دابنێ**

کاتێك بەڕێز گێنت باسی ئەو هەستە خۆشەی دەکرد کە بەهۆی قسەکردنەوە بۆ خەڵکی بەدەستی دەهێنێت، ئاماژەی بە شتێك کرد بەبڕوای من (زیاتر لە هەر هۆکارێکی دیکە) وای کردووە سەرکەوتوو بێت. ڕاستە شوێن ڕێنماییەکان کەوت و ئەرکەکانی جێبەجێ دەکرد، بەڵام دڵنیام بۆیە ئەو شتانەی کرد چونکە ویستی لەسەری بوو، لەبەر ئەوەی وەك وتاربێژێکی سەرکەوتوو خۆی دەبینییەوە. خەیاڵی بە داهاتووی خۆیەوە دەکرد و هەوڵی دەدا ئەو خەیاڵە بکات بە ڕاستی. بۆیە تۆش دەبێت ڕێك بەوشێوەیە بەیت.

سەرنج و بیرکردنەوەت کۆبکەرەوە و بزانە بەنیسبەت تۆوە متمانەبەخۆبوون و توانای قسەکردنێکی کاریگەر مانای چییە. بیر بکەرەوە بزانە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە چی بە تۆ دەبەخشێت، چی بە هاوڕێکانت دەبەخشێت، تا چەند توانات پێدەبەخشێت خزمەت بە خەڵك، کۆمەڵگا، یان دەوروبەرەکەت بکەیت، بزانە تا چەند کارگەری لەسەر ئاستی چالاکی و جموجوڵی بازرگانییەکەت هەیە. بەکورتی، توانای قسەکردن ئامادەت دەکات بۆ سەرکردایەتیکردن.

لـە بابەتێکـدا بـەناوی "ووتـاردان و سـەرکردایەتیکردن لـە بازرگانیـدا" نووسرابوو: "لەمێژووی کۆمپانیاکەماندا، پیاوێك بـەهۆی کـارێکی باشـەوە کە لـە کۆبوونەوەیەکدا ئـەنجامی دا، سـەرنجی هـەمووانی بـەلای خۆیـدا ڕاکێشا! بەڵێ، چەند ساڵێك لەمـەو پـێش، پیـاوێکی گـەنج کـە ئـەوکات بەرپرسی ناوچـەیەکی بچووکی ویلایـەتی کانسـاس بـوو، ووتـارێکی زۆر کاریگەری پێشکەش کرد، بەو هۆیەوە ئێستا ئەو کەسە جێگری سـەرۆکی کۆمپانیایەکە." بەوەشەوە نەوەستابوو، دوای ماوەیـەك بیسـتم بـووە بـە سـەرۆکی کۆمپانیـای "ناشـناڵ کـاش ڕێجیسـتـەر" کـە کۆمپانیایـەکی زەبەلاحی ئەمریکییە.

توانـای قسـەکردن دەتگەیـەنێت بـە شـوێنێك کـە هـیچ کـات پێشـبینیت نەکردبێت. هەرگیز ناتوانیت پێشبینی ئەوە بکەیت بـەهۆی قسـەکردنەوە دەگـەیت بـە کـوێ و بـە چـی. یـەکێك لـەو کەسـانەی لـە خولـەکانمان دەرچووبوو، هێنـری بلاکسـتۆن، سـەرۆکی کۆمپانیایـەکی ئـەمریکی بـوو، وتی: "توانای قسەکردن بۆ خـەڵکی بەشێوەیەکی کاریگـەر سـەرمایەیەکە لە مرۆڤدا کە دەیگەیەنێت بە لووتکە."

بـیر لـەوە بکـەرەوە چـەند خۆشـە کاتێـك لەبـەردەم گـوێگرێکی زۆردا وەستاویت و باسـی بیرکردنـەوە و ئـەزموون و بۆچـوونەکانی خۆتیـان بـۆ دەکـەیت. مـن وەك خـۆم چـەند جارێـك گەشـتم بـە زۆربـەی هـەرە زۆری وڵاتانـدا کـردووە، بـەڵام چـەند شـتێکی کـەم هـەن بگـەن بـە خۆشـیی قسەکردن و ووتاردان بۆ خەڵکی. کاتێك قسە بۆ خەڵك دەکەیت هەست بە بەهێزیی خۆت دەکەیت، هەست بە وزە و تواناکانت دەکـەیت. یـەکێك لـە خوێنـدکارەکانم دەیگـووت: "دوو خوولـەك پـێش ئـەوەی دەسـت بـە

قسەکردن بکەم، پێم خۆشە بە قامچی لێم بدەن وەك لەوەی دەستپێبکەم ئەوەندە ناخۆشە، بەڵام دوو خوولەك پێش ئەوەی تەواوبم، پێم خۆشە گوللەیەکم پێوە بنێن وەك لەوەی بووەستم."

ئێستا خۆت بهێنە پێش چاوی خۆت لەبەردەم کۆمەڵە کەسێکی زۆردا وەستاویت و بانگت دەکەن قسەیان بۆ بکەیت. خۆت دەبینیت بە متمانەوە هەنگاو دەنێت، کاتێکیش دەستپێدەکەیت، ئامادەبووان بێدەنگ دەبن و گوێت لێ ڕادەگرن، کاتێکیش دەڕۆیتەوە ماڵەوە، بیر لەوە دەکەیتەوە ئەو خەڵکە چەندە بەجوانی گوێیان گرتبوو، بیر لەو چەپڵە گەرموگوڕە بکەرەوە لەکاتی جێهێشتنی ستەیجەکەدا بۆت لێدەدەن، ئەنجا کاتێك بەلایاندا تێپەڕدەبیت، گوێت لەو وشە و سوپاس و پێزانینانە دەبێت کە ئامادەبووان ئاراستەت دەکەن. بڕوام پێ بکە، تام و چێژێك لەو پرۆسەدا هەیە هیچ کاتلەبیرت ناچێت.

ویلیام جەیمس، دیارترین پرۆفیسۆر لە بواری دەروونناسیدا لە زانکۆی هارڤارد، هەندێك ڕستەی نوسیووە کە دەکرێت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ژیانت هەبێت، چەند ڕستەیەك کە بۆ سەرکەوتن ئەوەندە کاریگەرن وەك ئەوە وایە بڵێی سم سم بکرێرەوە و بچیتە ناو گەنجینەیەك لە ئازایەتی و بوێرییەوە: "لە زۆربەی بابەتەکاندا، خۆشەویستی و بایەخدانت بەو بابەتە سەرکەوتووت دەکات. ئەگەر گرنگی تەواوەتی بە ئەنجامەکان بدەیت، بەدڵنیاییەوە بەدەستی دەهێنیت. ئەگەر حەز بکەیت باش بیت، ئەوە باش دەبیت. ئەگەر حەز بکەیت دەوڵەمەند بیت، دەوڵەمەد دەبیت. ئەگەر حەز بکەیت فێربیت، فێر دەبیت. بەڵام دەبێت ئاگات لەوەبێت زۆر تامەزرۆی ئەو شتە بیت کە دەتەوێت پێی بگەیت،

دەبێت شتانێکی تایبەت بن بەلاتەوە، نابێت وەك شتەکانی دیکە بەئاسایی سەیریان بکەیت."

باشتر وایە فێری ئەوە بیت بەشێوەیەکی *کاریگەر* قسە بۆ کەمەڵە کەسێك بکەیت، نەك تەنها بتوانیت بەشێوەیەکی ئاسایی و فەرمیت قسە بکەیت و کاریگەر نەبیت. بە واتایەکی دیکە، هەمووکات قسەکردن بۆ خەڵك گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە قسەکانت کاریگەر بن. گەر بێتو لەو کەسانەبیت تا ئێستا قسەیان بۆ خەڵك نەکردووە، ئەوە بەبەراورد بەو کەسانەی ئەزموونی ووتاربێژییان هەیە چەند قات سوود و کەڵکی زیاتر لەم کتێبە وەردەگریت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کاتێك ڕاهێنان دەکەیت هەست دەکەیت ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو پێش دەچیت، شتەکان بەلاتەوە تازەن بۆیە بەپەرۆشەوە هەوڵ دەدەیت. کاتێکیش هەستت کرد دەتوانیت بەپێوە بووەستیت و بەشێوەیەکی ژیران قسە بۆ کۆمەڵێك کەس بکەیت، ئەوکات دەتوانیت بە متمانە و دڵنیاییەکی زۆر زیاترەوە قسە بۆ تاکە کەس بکەیت. زۆرێك لە ژنان و پیاوان بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوە بەشداری خولەکەمیان دەکرد چونکە لە ناو کۆمەڵگەدا شەرمن و لاواز بوون. کاتێك بەشداری خولەکانیان کرد و هەتسیان کرد وا خەریکە دەتوانن قسە بۆ بەشداربووانی دیکەی خولەکە بکەن و ترسیشیان نییە، ئەنجا بۆیان دەرکەوت شەرمکردن شتێکی زۆر بێمانایە. دوای خولەکانیش هەوڵیان دا بەو متمانە و هاوسەنگییەی کە تازە بەدەستیان هێناوە، کارگەری لەسەر کەسانی دیکەش دروست بکەن لەوانەش: خێزانەکەیان، هاوڕێکانیان، هاویەشە بازرگانییەکانیان، هەروەها کڕیار و موشتەرییەکانیان. زۆربەی زۆری ئەوانەی بەشداری خولەکانی ئێمەیان

کردووە، وەك بەڕێز گودریچ، بەهۆی دەوروبەرەکەیانەوە بووە، بینیویانە ئەوان بەشدارییان کردووە و گۆڕانکارییەکی گەورە لە کەسایەتییاندا ڕوویداوە، ئەمانیش بڕیاریان داوە بەشداربن.

ئەم جۆرە ڕاهێنانە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر کەسایەتی دروست دەکات. ماوەیەك پێش ئێستا، پرسیارم لە دکتۆر داڤید ئەلمان (پزیشکی نەشتەرگەری و سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی تەندروستی ئەمریکی) کرد: بەڕای تۆ لەڕووی دەروونی و جەستەییەوە ئەو سوودانە چین کە کەسێك لە ئەنجامی مەشق و ڕاهێنانەکانی تایبەت بە ووتاردان دەستی دەکەوێت؟ بزەیەکی کرد و وتی دەتوانم بە نووسینی ڕەچەتەیەك وەڵامت بدەمەوە کە "هیچ دەرمانخانەیەك نەتوانێت پڕی بکاتەوە. تەنها دەبێت ئەو کەسە خۆی پڕی بکاتەوە کە خەریکی ئەو ڕاهێنانەیە: ئەگەر پێیشی وابێت ناتوانێت، ئەوە زۆر هەڵەیە."

ئێستا ئەو ڕاپۆرتەی دکتۆر داڤید نووسی، لەسەر مێزەکەمدایە. هەر جارێك کە دەیخوێنمەوە، سەرسام دەبم. ئەمەش نووسراوەکەی دکتۆر ئەلمانە وەك خۆی:

ئەوپەڕی هەوڵی خۆت بدە بۆ ئەوەی ئەو توانایە بەدەست بهێنیت کە کارێك بکەیت کەسانی دیکە بتوانن مێشك و دڵت بخوێننەوە. فێر بە بیرۆکە و بۆچوونەکانت بۆ کەسانی دیکە ڕوون بکەیتەوە، هەم لەسەر ئاستی تاکە کەس و هەم لەسەر ئاستی کۆمەڵ. کاتێك هەوڵی ئەمە دەدەیت و دەتەوێت بەرەوپێش بچیت و بگەیت بەو ئاستەی بەڕوونی بۆ بەرانبەر قسە بکەیت، دەبینیت کاریگەری لەسەر دەوروبەر دروست

دەکەیت و بەجۆرێك سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشیت کە تا ئێستا شتی لەو شیوەیەت نەکردبێت.

دەتوانیت لەم نووسراوەی دکتۆرەوە دوو سوود وەرگریت: کاتێك هەوڵی فێربوون دەدەیت، متمانە و بڕوابەخۆبوونت بەهێزتر دەبێت، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ خەڵکدا کەسایەتییەکی باشتر و گەرموگوڕترت دەبێت. ئەمەش بەو مانایە دێت کە لەڕووی هەست و سۆزەوە باشتر دەبیت، ئەگەر لەڕووی هەستیشەوە باشتر بیت، لەڕووی جەستەییشەوە باشتر دەبیت. ووتاردان لە دونیای ئێستاماندا بۆ هەموو کەسێکە، ژن و پیاو، گەنج و پیر. نازانم بەدیاریکراوی لەڕووی بازرگانییەوە سوودی چییە، بەڵام دەزانم سوودە تەندروستییەکانی چین. هەرکات توانیت بۆ چەند کەسسێك یان کۆمەڵە کەسێك قسە بکە، دەبینیت باشتر و باشتر دەبیت، هەست دەکەیت لاشەت سووکە، هەست بە بوونی خۆت دەکەیت، هەست دەکەیت کەسێکی بەهرەمەندیت، بەجۆرێك کە پێشتر هەستی لەو شێوەیەت بۆ دروست نەبووبێت. شتێکی زۆر خۆشە ئەو هەستەت هەبێت، هیچ دەرمان و حەپێك ناتوانێت ئەو هەستەت پێ ببەخشێت.

دووەم ڕێبەری ئەوەیە وا خەیاڵ بکەیت بەشێوەیەکی زۆر سەرکەوتوو ئەو شتە دەکەیت کە لە ئەنجامدانی دەترسیت، هەروەها پێویستە بیرۆ هۆشت لای ئەو سوودانە بێت کە بەهۆی توانای قسەکردنتەوە لەبەرانبەر کۆمەڵەکەسێکدا دەستت دەکەوێت. وشەکانی ویلیام جەیمست لەیاد نەچێت: " ئەگەر گرنگی تەواوەتی بە ئەنجامەکان بدەیت، بەدڵنیاییەوە بەدەستی دەهێنیت."

## سێیەم/ پێشوەخت مێشکت بۆ سەرکەوتن ئامادە بکە

جارێکیان لە بەرنامەیەکی ڕادیۆییدا داوایان لێکردم گرنگترین وانە کە لە ژیانمدا فێری بووم، بە سێ ڕستە بیڵێم. منیش وتم: "گەورەترین وانە کە فێری بووم گرنگی ئەو شتەیە بیری لێ دەکەینەوە. ئەگەر من بمزانیایە تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە، دەمزانی تۆ کێیت. بیرکردنەوەکانت دەتکەن بەو کەسەی کە هەیت. بە گۆڕینی بیرکردنەوەکانمان، دەتوانین ژیانیشمان بگۆڕین."

ئێستا تۆ ئامانجت ئەوەیە ئاستی متمانەبەخۆبوونت بەرز بکەیتەوە و کارێك بکەیت گفتوگۆکانت کاریگەربن. لە ئێستا بەدواوە، دەبێت بەشێوەیەکی ئەرێنی بیر لەو دەرفەتانە بکەیتەوە کە لەم ڕێگەیەدا دێنە پێشت. دەبێت کاتێك هەوڵ دەدەیت قسە بۆ کۆمەڵە کەسێك بکەیت، بەشێوەیەکە ئەرێنیبی لەو دەرەنجامانە بکەیتەوە کە تووشت دەبن. دەبێت بەرگی پێداگیری و سووربوون بکەیت بە بەری هەموو ڕەفتار و گوفتارێکدا کە لەم بوارەدا بەکاریان دەهێنیت ـ کاتێك دەتەوێت پەرە بە توانا و کارامەیی قسەکردن بدەیت، دەبێت بە ڕۆحێتێکی بەرزەوە قسە بکەیت و سووربیت لەسەر وشەکانت.

ئەم بەسەرهاتە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت لە ناخی هەموو ئەو کەسانەدا هەستێکی زۆر بەهێز هەیە کە دەیانەوێت ببن بە کەسێکی کاریگەر لە قسەکردندا. ئەو پیاوەی کە ئێستا بۆتان باس دەکەم، بە پەیژەی پیشەکەیدا ئەوەندە خێرا سەرکەوت کە ئێستا ئەفسانەیەکی بواری بازرگانییە، کەچی یەکەم جار کە لە زانکۆ هەستایە سەر پێ و ویستی قسە بکات، زمانی بەگوێی نەکرد و وشەکانی بۆ نەوترا. ئەو سیمینارەی

مامۆستا بۆی دەستنیشان کردبوو تەنها پێنج خولەك بوو، بەلام نەیتوانی تا نیوە زیاتر بڕوات. ڕووخساری سپی هەلگەڕا و بە فرمێسکەوە ستەیجەکەی بەجێهێشت.

ئەو پیاوەی کە وەك خوێندکارێکی گەنج بەو ئەزموونە تالەدا تێپەڕی، نەیهێشت ئەو شکستەی بیوەستێنێت. بڕیاریدا ببێت بە قسەکەرێکی باش، لەو بڕیارەی کۆلی نەدا تا بوو بە ڕاوێژکارێکی ناوداری حکومەتەکەی خۆی. ئەو کەسەش ناوی "کلارێنس بی ڕاندل" بوو. لە یەکێك لە کتێبەکانیدا بەناوی *ئازادی بیروبڕوا*، لەبارەی ووتاردانەوە دەلێت: "من لە قۆلی ڕاستمەوە تا دەگاتە قۆلی چەپم خەت بەسەر شانمەوەیە[١]. خزمەتێکی زۆرم هەیە لە ڕێکخراو و دەزگا حکومییەکاندا، لە کەمپینی خێرخوازیدا دەستێکی بالام هەیە... وە هەروەها. لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە ووتارێکی نیشتیمانیی لە ویلایەتی میشیگان قسەم کردووە. لەگەل میکی ڕوونیدا چەندین جار حەملە و گەڕانی خێرخوازیمان کردووە، لەگەل سەرۆکی زانکۆی هارڤارد و زانکۆی شیکاگۆدا بەمەبەستی پێشکەشکردنی بابەتی پەروەردەیی، چەندین شوێن و کوچە و کۆلان گەڕاوین. تەنانەت بە فەڕەنسییەکی لاوازەوە، شەوانە دوای هەموو نانخواردنێك قسەم بۆ ئامادەبووان کردووە.

"پێموابێت دەزانم ئامادەبووان گوێ لە چی دەگرن، وە دەزانم دەیانەوێت چۆن قسەکانت بکەیت. بۆیە هیچ شتێك نییە مرۆڤ هەولی بۆ بدات و

---

[١] لە یاسای سەربازی ئەمریکیدا هەر خەتێك یەکسانە بووە بە سێ سال خزمەت، وەك نەجمە لە کوردستان - وەرگێڕ.

بەدەستی نەهێنێت، مرۆڤ ویستی لەسەر هەر شتێك بێت و كاری بۆ بكات، هەر بەدەستی دەهێنێت."

منیش هاوڕام لەگەڵ بەڕێز ڕاندڵدا. دەبێت ویست و ئیرادە بەشێكی گرنگ بن بە هەوڵەكانت بۆ بوون بە قسەكەرێكی بەهێز. ئەگەر ئێستا بمتوانیبا تەماشای ناو مێشكت بكەم و بمزانیایە تا چەند ویست و ئیرادەت بەهێزە، وە بمزانیایە بیركردنەوەكانت چۆنن، دەمتوانی پێشبینت بۆ بكەم و بزانم تا چەند لە گەشتن بە ئامانجەكەت خێرایت و ئاستی توانای سەركەوتنت دەچێت.

لە یەكێك لە خولەكانم ، هەر یەكەم شەو پیاوێك بەبێ ترس و بێ شەرم هەستایە سەر پێ و وتی: وەك بەڵێندەرێك تا نەبم بە وتەبێژی كۆمەڵەی بەڵێندەران، دڵم ئاو ناخواتەوە. ئەو كابرایە هیچی دیكەی نەدەویست جگە لەوەی بە هەمووان بڵێت كێشە و چارەسەرەكانی كاری بەڵێندەرایەتم دۆزیوەتەوە. ئەو كەسەش ناوی جۆی هاڤەر ستیك بوو. ئەوەی ئەو وتی زۆر بەڕاستی بوو. لەو خولەدا جۆرە خوێندكارێك بوو كە مامۆستاكەشی سەرسام كردبوو: لەوپەڕی تامەزرۆیی و ئیراد بەرزیدا بوو. حەزی دەكرد بتوانێت قسە بۆ خەڵك بكات، نەك تەنها لەسەر ئاستی ناوخۆیی، بەڵكوو لەسەر ئاستی نیشتیمانی، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دوودڵی و ساردییەكیشی پێوە دیار نەبوو. زۆر بەوردی قسەكانی ئامادە دەكرد، بەوریایی مەشقی لەسەر دەكردن، هیچ كاتێكیش یەك وانەی لەكیس نەچوو، ئەمە لەكاتێكدا ئەو ماوەیە ئیشی زۆریشی هەبوو، زۆر سەرقاڵ بوو. وەك هەر بەشداربوویەكی دیكە ڕێنماییەكانی بەوردی ئەنجام دەدا –

بەجۆرێك گەشەی کرد کە خۆیشی پێی سەیربوو. لەماوەی دوو مانگدا بوو بە یەکێك لە بەشداربووە دیارەکانی خوولەکە.

ئەو مامۆستای کە لەو خولەدا وانی پێ دەگووتنەوە، دوای ساڵێك لە ڤێرجینیا بوو، ئەمەی نوسیبوو: "خەریکبوو هەموو شتێکم لەبارەی جۆی هاڤەرستیکەوە لەبیردەچوویەوە، ماوەیەکی زۆربوو نەمبینیبوو. بەیانییەك کاتێك نانی بەیانیم دەخوارد، تەماشای هەواڵەکانم دەکردن. تەماشا دەکەم وێنەی جۆی و هەندێك نووسراوم بینی. هەواڵەکە باسی لەوە دەکرد شەوی ڕابردوو کۆبوونەوەی لەگەڵ بەڵێندەرانی ناوچەکەی خۆی کردووە و قسەی بۆ کردوون. سەیر دەکەم جۆی تەنها قسەکەرێك نییە لە کۆمەڵەی بەڵێندەراندا، بەڵکوو سەرۆکیانە!"

لەبەر ئەوە گەر بتەوێت لەکارێکی وەهادا سەرکەوتوو بیت، دەبێت ئەو تایبەتمەندییانەت تێدابێت کە بەشێکی بنەڕەتین لەو کارەدا، تایبەتمەندییەکانیش بریتین لە: حەزێکی زۆر بەهێز، بەردەوامی و سووربوونێك کە کێوەکان ڕامالن، هەروەها بڕوا و متمانە بەوە سەرکەوتوو دەبیت.

ئایا کاتێك جولیەس سیزەر بە کەشتیگەل بەڕێکەوت بەرەو فەڕەنسا و دواتر لەگەڵ سوپاکەی لە ئینگیلتەرای ئێستا گیرسایەوە، چی کرد بۆ ئەوەی سوپاکەی دڵنیا بکاتەوە کە سەرکەوتوو دەبن؟ شتێکی زۆر ژیرانەی کرد: لە کەناری ئاوەکەدا کە شوێنێکە بەرز بوو، سوپاکەی وەستاند، تەماشای شەپۆلەکانی دەکرد لە خوارەوە دەهاتن و دەچوون، دەیانبینی وا ئاگر کەشتییەکان دەسوتێنێت. ناوچەی بەرانبەریشیان کە دوژمنەکانی لێیە، تاکە شوێنە بتوانن بەهۆیەوە بگەن بەو وڵاتە، تاکە

ڕێگایەکیش کە بۆ کشانەوە هەیانبوو، ئەویش سووتا، بۆیە هیچ چارەیەکیان نەبوو تەنها بەرەوپێشچوون نەبێت، ناچار دەبوو بچن و ناوچەی دوژمن داگیر بکەن. بەڵێ، سیزەر بەو شێوەیە هەنگاوی دەنا و دەجوڵایەوە. هەمووانی ناچار کرد بەرەوپێش بچن و بیر لە گەڕانەوە نەکەنەوە.

سیزەر چەندی ڕۆحێتێکی بەهێزی هەبوو! ئەی بۆچی تۆش بەو شێوەیە نابیت، بڕیار بدەیت ئەو ترسە ببەزێنیت کە لە ئامادەبووان هەتە؟ هەر بیرکردنەوەیەکی نەرێنیت هەیە فڕێی بدە ناو ئاگرەوە و دەرگاش بەڕووی هەموو کشانەوەیەک بەرەو ڕابردووت دابخە.

**چوارەم/ هەموو درفەتەکان بقۆزەوە**

ئەو خولانەی لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەمان گووتەوە، بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو گۆڕانکارییان تێدا کراوە. هەموو ساڵێك بیرۆکەی نوێمان بۆ خوولەکانمان زیاد دەکرد و بیرۆکە کۆنەکانمان لادەبرد، بەڵام یەکێك لە تایبەتمەندییەکان هیچ کات نەگۆڕا و وەك خۆی ماوەتەوە: هەموو بەشداربوویەك پێویستە و دەبێت بۆ یەك جاریش بێت هەستێتە سەر پێ و ـ بەشێوەیەکی گشتی دووجار ـ قسە بۆ هاوڕێکانی خۆی بکات. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك تا نەچێتە ناو خەڵك و قسەیان بۆ بکات فێری قسەکردن نابێت. ئەو کەسەی دەیەوێت بەبێ چوونە ناو خەڵك فێری ووتاردان بێت، وەك ئەوە وایە کەسێك بەبێ ئەوەی بچێتە ناو ئاو، بیەوێت فێری مەلەکردن بێت. دەکرێت هەموو ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە کە لەسەر ووتاردان نوسراون، بەم کتێبەی بەردەسیشتەوە ـ لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانیت قسە بکەیت. ڕاستە ئەم

کتێبە ڕێبەرییەکی وردودرشتە، بەڵام دەبێت پێشنیار و هەنگاوەکانی پیادە بکەیت و جێبەجێیات بکەیت.

کاتێك پرسیاریان لە جۆرج بێرنارد شۆ کرد چۆن فێریووە بەو شێوە سەرنجڕاکێشە قسە بۆ خەڵك بکات، بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "بەو شێوەیە فێریووم کە فێری خلیسکێنە بووم ــ زۆر کەللەڕەق بووم و زۆریش تەریق دەبوومەوە تا وام لێهات فێر بووم." بێرنارد شۆ بە گەنجی شەرمنترین کەس بوو لە لەندەندا. هەموو کاتێك گەر بیویستایە لە دەرگایەك بدات، زیاتر لە ٢٥ خولەکی پێدەچوو ئەوەندە شەرمی دەکرد. خۆی دان بەوەدا دنێت و دەڵێت، "کەم کەس هێندەی ئەو بەدەست شەرمنییەوە ئازاری چەشتووە و تەریق کراوەتەوە."

لەکۆتاییدا، باشترین و خێراترین و دڵنیاترین ڕێگای بۆ زاڵبوون بەسەر شەرمنی، لاوازی، و ترسدا دۆزییەوە. بڕیاری دا خاڵی لاوازی بکات بە بەهێزترین سەرمایە بۆ خۆی: بەشداری لە دیبەیتێکدا کرد. لە هەموو کۆبوونەوە و کۆڕەکانی لەندەندا، کە گفتوگۆی کراوەی تێدا ئەنجام دەدرا، بەشداری دەکرد، هەموو جارێکیش بەشداری دیبەیتەکانی دەکرد و قسەی خۆی هەبوو. بەهۆی ئەوەی پشتگیریی پارتی سۆشیالیستی دەکرد و بەناو خەڵکدا دەگەڕا و قسەی بۆ ئەو پارتە دەکرد، بێرنارد شۆ بوو بە یەکێك لە درەوشاوەترین و بەهێزترین ووتاربێژەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

لە هەموو لایەکەوە دەرفەتی قسەکردن بوونی هەیە. کاری خۆبەخشی بکە و بڕۆ ناو ئەو ڕێکخراوانەی کە چالاکییەکانیان پێویستی بە قسەکردنە. ئەگەر بۆ وتنی یەك ڕستەش بێت لە کۆبوونەوە و کۆڕەکاندا

بەشدار بە و بەڕوونی قسەی خۆت بکە. لە پۆلدا یان لە زانکۆدا مەچۆرە دواوە دانیشیت. قسە بکە! بابەت پێشکەش بکە. ببە بە نوێنەری گروپ. هەر کۆمەڵە و کۆبوونەوەیەك کە دەرفەتی ئەوەی هەیە بتوانیت قسەی تێدا بکەیت، برۆ و بەشدار بە. دەبێت چاو بۆ دەوروبەری خۆت بگێڕیت بزانیت هیچ چالاکییەکی بازرگانی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، پیشەیی، تەنانەت بۆنە و ئاهەنگی دراوسێکانیشت نییە تا بەشدارییان تێدا بکەیت و قسە بکەیت. تا قسە بۆ خەڵك نەکەیت نازانیت چەنێك خێرا بەرەوپێش دەچیت و گەشە دەکەیت، بۆیە قسە بکە، قسە بکە، و قسە بکە.

جارێکیان بازرگانێکی لاو وتی: "من هەموو ئەو شتانە دەزانم، بەڵام دوودڵم و تاقەتم نییە هەوڵی فێربوون بدەم."

منیش وتم: "تاقەت!" ئەو بیرکردنەوە لە مێشکت لابە. تۆ هەرگیز بە ڕۆحێتێکی دروست بیرت لە فێربوون نەکردووەتەوە."

وتی، "کام ڕۆحییەت؟"

پێم گووت، "ڕۆحیەتی سەرکێشیکردن." ئەنجا کەمێك باسی ئەوەم بۆ کرد کە چۆن لەڕێگەی قسەکردنەوە بۆ خەڵکی و بەهێزکردن و دەرخستنی کەسایەتی خۆتەوە دەتوانیت بگەیت بە سەرکەوتن.

لە کۆتاییدا وتی، "میش تاقی دەکەمەوە و دێمە ناو ئەو سەرکێشیەوە."

تۆش بەهەمان شێوە لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، و لەکاتی پیادەکردن و بەرجەستەکردنی بنەما و یاساکاندا، دەچیتە ناو ئەو سەرکێشییەوە. تێدەگەیت جۆرە سەرکێشییەکە کە تیایدا هێزی سەربەخۆیی و دیدگای تایبەتییەکانت بەهێزت دەکەن و بەردەوامیت پێ

دەبەخشن. تێدەگەیت ئەمە جۆرە سەرکێشییەکە کە دەکرێت هەم لە ناخ و هەم لە ڕووکەشەوە بتگۆڕێت.

## ((بەشی دووەم))

# پەرە بە ئاستی بڕوابەخۆبوونت بدە

---

"بەڕێز کارنگی، پێنج ساڵ پێش ئێستا هاتم بۆ ئەو ئوتێلەی کە خەریکی بەجێگەیاندنی یەکێك لە سیمینارەکانت بوویت. هاتمە بەردەم دەرگای ژوورەکە و لەپڕ وەستام. دەمزانی گەر لەو دەرگاوە بێمە ژوورەوە و بەشداری ئەو خولە بکەم، زوو بێت یان درەنگ، دەبێت منیش وەك ئەوانی دیکە هەستم و قسە بۆ ئامادەبووان بکەم. دەستم بە دەسکی دەگاکەوە بەستبووی. نەمتوانی بێمە ژوورەوە. ئەوەبوو ڕووم وەرگێڕا و لە ئوتێلەکە هاتمە دەرەوە.
ئەگەر ئەوکات بمزانیایە ئەوەندە بەو ئاسانییە فێرمان دەکەیت بەسەر ترسدا زاڵبین، ترس لە ئامادەبووان، ئێستا ئەو پێنج ساڵەم لەدەست نەدەچوو."
ئەو پیاوەی ئەم وتە سەرنجڕاکێشانەی گووت هەروا لەسەر مێزێك ئەو قسانەی نەکرد، بەڵکوو ڕووی دەمی لە ۲۰۰ گوێگر بوو. ئاهەنگی دەرچووانی یەکێك لە خوولەکانم بوو لە شاری نیویۆرك. کاتێك قسەی دەکرد، سەرسام بووم بەو متمانە و دڵنیاییەی لە قسەکانیدا ڕەنگیان دابوویەوە. من وەك ڕاهێنەری ئەو، زۆر خۆشحاڵ بووم کە توانی بەسەر ترسێکی کوشندەدا زاڵبێت. بیر دەکەمەوە ئاخۆ ئەگەر ئەو کابرایە پێنج

یان دە ساڵ زووتر بیتوانیایە بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بێت، ئێستا چەندە سەرکەوتووتر و خۆشبەختتر دەبوو.

شاعیر و نووسەری ئەمریکی ئیمێرسن دەڵێت، "لە دونیادا هیچ شتێك هێندەی ترس مرۆڤ تووشی شکست ناکات." ئاهە، چەندە باش ئاگاداری لەو ڕاستییە تاڵەم. چەندە خۆشبەختم کە تا ئێستا هەموو ژیان توانیوومە خەڵکی لە ترس ڕزگار بکەم. کاتێك لە ساڵی ١٩١٢دا دەستم کرد بە وتنەوەی خولەکانم، نەمدەزانی کە خول و ڕاهێنانەکانم یەکێکن لە باشترین ئەو ڕێگایانەی هاوکاری خەڵکیدەکەن تاوەکوو بتوانن ترسەکانیان بڕەوێننەوە و هەستی خۆبەکەمزانین لە ناخیاندا دەربکەن. بەهۆی ووتاربێژی و قسەکردنەوە بەشێوەیەکی سروشتی بەسەر ترس و شەرمنیدا زاڵدەبیت و متمانە و بوێرییت بۆ دروست دەبێت. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی قسەکردن و ووتاربێژی ناچارمان دەکات لەگەڵ ترسدا مامەڵە بکەین.

لەکۆی گشتی ئەو ساڵانەی مەشقم بە ژنان و پیاوان کردووە، هەندێك بیرۆکەم هەڵبژاردووە بۆت تاوەکوو بتوانیت زۆر بەخێریی بەسەر ڕاڕایی و پەشۆکاویدا سەرکەویت و لەماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا بتوانیت متمانەبەخۆبووت زیاد بکەیت.

## یەکەم/ ئەو ڕاستیانە بزانە کە تایبەتن بە ترسی ووتاربێژی

**ڕاستی یەکەم:**

***هەر بەتەنها تۆ نیت لە قسەکردن دەترسیت.*** توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە ٨٠ بۆ ٩٠ لە سەدی ئەو کەسانەی بەشداری خولی

ووتاربێژییان کردووە، لە سەرەتای خولەکەدا بەدەست پەشۆکان و ترسی قسەکردنەوە نالاندوویانە. بەبڕوای من ڕێژەکە لەناو گەنجاندا زیاترە، نزیکەی ١٠٠٪ە.

**ڕاستی ژمارە دوو:**

*بڕێکی دیاریکراو لە پەشۆکان و ترس لە سەرەتادا شتێکی بەسوودە!*

ئەوە شێوازێکی سروشتییە لە ناخماندا بوونی هەیە و بۆ شتە نائاساییەکان ئامادەمان دەکات. بۆیە کاتێك هەست دەکەیت دڵت خێراتر لێدەدات و هەناسەدانت زیاتر دەبێت، هیچ نیگران مەبە. جەستەت، کە هەموو کاتێك ئاگاداری پاڵنەرە دەرەکییەکانە، خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەوەی بچێتە ناو ئەو کارەوە. ئەگەر ئەو ئامادەکارییە دەروونییانە لە سنوری خۆیدا بێت، دەتوانیت خێراتر بیر بکەیتەوە، پاراوتر قسە بکەیت، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی گوڕ و تینێکی زیاترت دەبێت بەراورد بە کاتە ئاساییەکان.

**ڕاستی ژمارە سێ:**

*زۆربەی ووتاربێژە سەرکەوتووەکان لەوە دڵنیایان کردوومەتەوە کە ئەوانیش هیچ کاتێك نەیانتوانیوە بەتەواوی شڵەژاوی لە ناخی خۆیان* دەربکەن. هەموو کاتێك پێش قسەکردن شڵەژاوییان بۆ دروست بووە، ڕەنگە ئەو شڵەژاوییە تا وتنی چەند ڕستەیەکی سەرەتاش هەر بەردەوامبێت. ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەیە دەیانەوێت وەك ئەسپی پێشبڕکێ بن، نەك وەك ئەسپی دابەستە و ماڵی پاڵی لێ بدەنەوە و هیچ هێز و گوڕوتینێکیان نەبێت. ئەو قسەکەر و ووتاربێژانەی کە دەڵێن

هەموو کاتێک وەک ماستی مەیو واین و هیچ کێشەمان نییە لەکاتی قسەکردندا، هەر هێندەی توێژی ماستیش بەهێزن و هێندەی سەتڵێک ماستیش ئیلهلم بە خەڵکی دەبەخشن. بەڵام ئەوانەی هەست بە کەمێک پەشۆکان دەکەن، ئەوانەن وەک ئەسپی پێشبڕکێ بەردەوام لە هەڵپە و بەرەوپێشچووندان.

**ڕاستی ژمارە چوار:**

*هۆکاری سەرەکی ئەو ترسەی لە قسەکردن هەتە ئەوەیە کە پێشتر قسەت بۆ خەڵک نەکردووە.* پرۆفیسۆر ڕۆبنسن لە کتێبەکەیدا دەڵێت: "ترس نەوەیەکی زۆڵە لە نەزانی و گومانەوە لەدایک دەبێت." بەنیسبەت زۆربەی خەڵکەوە، ووتاربێژی بابەتێکی فەرامۆشکراوە، لەبەر ئەوەیە دەبینیت کابرا پڕە لە ترس و نیگەرانی. بەنیسبەت ئەو کەسانەی سەرەتایانە، ئەم پرۆسە پڕە لە زنجیرەیەك بارودۆخی ئاڵۆز، زۆر ئاڵۆزتر لە فێربوونی یاری تێنس یاخود شۆفێری. بۆ ئەوەی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە سادە و ئاسان بکەیت، تەنها شتێك ئەنجام بدە: ڕاهێنان، ڕاهێنان، ڕاهێنان. ئەوکات تۆش وەك ئەو هەزاران کەسەی دیکە تێدەگەیت کە، ووتاربێژی دەکرێت شتێکی چێژبەخش بێت وەك لەوەی شتێکی ناڕەحەت و ئەستەم بێت، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە لە ووتاردان و قسەکردندا ئەزموونێکی سەرکەوتووت هەبێت.

لەوکاتەی بەسەرهاتی دەروونناسی بەناوبانگ ئەلبێرت ئێدوارد ویگام خوێندووەتەوە کە باس لە چۆنییەتی زاڵبوونی بەسەر ترسەکەیدا دەکات، تا ئێستاش وەك هاندەرێکی گەورە و ئیلهامبەخش تەماشای دەکەم .

بۆمان دەگێڕێتەوە کە کاتی خۆی چەندە تۆقیبوو لەوەی لە قوتابخانەدا هەستێت و ڕاپۆرتێك پێشکەش بکات.

بەم جۆرە خۆی دەگێڕێتەوە: "کاتێك ڕۆژی ڕاپۆرتەکە نزیك بوویەوە، نەخۆش کەوتم. هەرکاتێکیش بیرم لێدەکردەوە، دەمارەکانی سەرم پڕدەبوون لە خوێن و ڕوومەتم سور هەڵدەگەڕا و ئەوەندە ئازارم هەبوو کە دەچوومە دەرەوە بۆ پشتی قوتابخانەکە و ڕوومەتم دەنا بە دیوارەکەوە بۆ ئەوەی فێنکی بکەمەوە. لە زانکۆش هەر بەو شێوەیە بووم.

"جارێکیان بەوردی سەرەتای ڕاپۆرتەکەم لەبەرکرد، 'ئادەم و جێفەرسن ئیتر...' کاتێك ڕووم لە ئامادەبووان کرد، سەرم گێژی دەخوارد، بەباشی نەمدەزانی لەکوێدام. توانیم بەهەر حاڵێك بێت یەکەم ڕستە بڵێم: ئادەم و جێفەرسن کۆچی دواییان کرد. یەك وشەی دیکەم بۆ نەوترا، بۆیە خۆمم چەماندەوە ... ئەنجا بەڕێزەوە لەناوجەرگەی چەپڵەڕێزاندا چوومەوە شوێنی خۆم. سەرۆك بەش هەستایە سەر پێ و بە ڕابەواردنێکەوە وەك توانج وتی، 'ئافەرم ئێدوارد، سەرسام بووین بە بیستنی ئەو هەواڵە ناخۆشە، بەڵام ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دەدەین بتوانین بەرگەی ئەو بارودۆخە سەخت بگرین. بەڕاستی کاریگەر بوو.' ئیتر مردن چییە! ئەو کاتەی قاقای پێکەنین شوێنەکەی داگیرکردبوو، مردن خۆشترین شت بوو دەستم بکەوتایە. چەند ڕۆژێك دوای ئەوەش هەر نەخۆش بووم، لەو کاتەدا ئەوەی لە دونیادا ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە ئەوە بووە ببم بە ووتاربێژ."

ساڵێك دوای ئەوەی زانکۆی بەجێهێشت، ئەلبێرت ویگام لە دێنڤەر - ویلایەتی کۆلۆرادۆ بوو. کەمپینی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٩٦ ڕۆژ بە ڕۆژ

لەسەر دراوی ئەوکات کە زیو بوو، توندتر دەبوو. شایەنی باسە ئەو کێشەیە لە ئەمریکادا بەشێوەیەك بەرچاو تەشەنەی سەندبوو. کۆنگرێس بڕیاری دا دراوی زیوی لەو وڵاتەدا هەڵوەشێنێتەوە و چیتر مامەڵەی پێوە نەکرێت. کۆمەڵێکی زۆر دژایەتییان دەکرد و جوڵانەوەیەکیان بۆ بەرگریکردن لەو بابەتە دامەزراند. ئەوەبوو ڕۆژێکیان ئەلبێرت ویگام نامیلکەیەکی خوێندەوە باسی ئەو کێشەیەی دەکرد و پێشنیاری دراوی زیوی دەکرد لانەبرێت. ئەمیش لەسەر ئەو بابەتە و بەڵێنە درۆینەکانی سەرۆك و داروودەستەکەی زۆر تووڕەبوو. تا وای لێهات کاتژمێرەکەی دەستی فرۆشت بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە نیشتیمانی خۆی ــ هیندستان. جارێکیان لەوێ ویستی لەسەر بابەتی "دراوی سەلامەت" قسە بکات. زۆربەی هاوڕێ کۆنەکانی قوتابخانەی لەوێ بوون. خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "کاتێك دەستم پێکرد، بابەتی ئادەم و جێفەرسن کە لە زانکۆ پێشکەشم کرد، هاتەوە بیرم و زۆر کاری تێکردم. تفم بۆ قووت نەدەدرا و زمانم تێکەڵی دەکرد، بەڵام هەرچۆنێك بێت منیش و گوێگریش بەرگەمان گرت و توانیم پێشەکییەك بڵێم. ئەو تۆزە قسەکردنە بوو بە هاندەرێك بۆم، ئەوەندەی بیرم بێت بۆ ماوەی پانزە خوولەك لە قسەکردن بەردەوام بووم. ئەوەی زۆر سەرسامی کردم ئەوەبوو کە دواتر بۆم دەرکەوت یەك کاتژمێر نیو قسەم کردووە!

"ئەوەبوو لە چەند ساڵی دواتردا، یەکێکبووم لەو کەسانەی کە وەك ووتاربێژێکی سەرکەوتوو دەرکەوتم، شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو بەڕاستی. هەر لە سەرەتاوە تێگەشتم ویلیام جەیمس مەبەستی چیبوو لەوەی دەیگووت *ڕاهاتن بە سەرکەوتن*."

بەڵێ، ئەلبێرت ئێدوارد گەشتبووە ئەو بڕوایەی: یەکێك لە دڵنیاترین و کاریگەرترین ڕێگاکانی سەرکەوتن بەسەر ئەو ترسە کوشندەی لە قسەکردندا هەتە ئەوەیە کە ئەزموونێکی سەرکەوتوو تۆمار بکەیت و بە سەرکەوتن ڕابێیت.

پێویستە بەلاتەوە ئاسایی بێت کاتێك قسە بۆ خەڵکی دەکەیت، وەك شتێکی سروشتی هەندێك ترست بۆ دروست دەبێت، هەروەها پێویستە پشت بەو شڵەژان و ترسە کەمە ببەستیت بۆ ئەوەی یارمەتیدەرت بێت بەشێوەیەکی باشتر وتەکانت پێشکەش بکەیت، بەڵام ئاگادار بە دەبێت ترسێکی کەم و سنورداربێت.

ئەگەر هاتوو ئەو ترسەی سەرەتا بۆت دروست دەبێت زیاد لە سنوری خۆی تێپەڕی کرد و کاریگەری قسەکانتی کەمکردەوە: بەجۆرێك بیرکردنەوەکانت قوفڵبن، زمانپاراویت کەمبێتەوە، خۆت بۆ کۆنترۆڵ نەکرێت، ڕوومەت و لێوەکانت بلەرزن، هەروەها ماسولکەکانت کرژبن، پێویست ناکات نائومێد بیت. بۆ ئەوانەی سەرەتایانە ئەو نیشانانە شتێکی نامۆ نین. ئەگەر هەوڵی بۆ بدەیت، لە ماوەیەکی کەمدا تێدەگەیت ئەو ترسەی سەرەتا بۆت دروست دەبێت، بەجۆرێك کەم دەبێتەوە تا دەگاتە خاڵێك سوودی لێ ببینیت.

**دووەم/ بەشێوەیەکی دروست خۆت ئامادە بکە**

چەند ساڵێك لەمەوبەر قسەکەری سەرەکی ڕێکخراوی *نیویۆرك ڕۆتری* کاربەدەستێکی دیاری حکومەت بوو. ئێمەش زۆر تامەزرۆ بووین گوێمان لێبێت باسی کار و چالاکیی ڕێکخراوەکەیان بکات.

زۆر بەئاشکرا پێیەوە دیار بوو کە ئامادەکاری بۆ قسەکانی نەکردبوو. سەرەتا هەوڵی دا لەخۆیەوە و بەدڵی خۆی قسە بکات. ئەوەبوو نەیتوانی، بۆیە هەندێك تێبینی لە گیرفانیدا دەرهێنا، بەڵام زۆر بەڕوونی دیاربوو ئەو تێبینییانەی بەدەستییەوە بوون لە ڕێکخستندا لە ئۆتۆمبیلێکی گەورە دەچوو کە پڕیبێت لە ئاسنە شکاو. هەندێك بەو تێبینییانەوە خۆی سەرقاڵ کرد و کەمێك قسەی کرد، بەڵام تا دەهات شەرمەزارتر دەبوو، تا وای لێهات تەواو شپرزە بوو. سات بە سات داماوتر و شڵەژاوتر دەبوو، بەڵام بەردەوام بوو لە قسەکردن، زوو زوو داوای لێبووردنی دەکرد، بەردەوام هەوڵی دەدات هەندێك شت لەو تێبینییانە دەربهێنێت و ڕێکیان بخات و قسەیەکی پووخت بکات، لەگەڵ ئەوەشدا جار جار پەرداخێك ئاوی دەبرد بۆ لێوە وشکەکانی. دیمەنێکی خەماوی بوو کە ئاوا ترس تەواو دایگرتبوو، هەمووی تەنها بەهۆی ئەوەبوو بەباشی خۆی ئامادە نەکردبوو. لەکۆتاییدا چاری نەما دانیشت، زەلیلترین ووتاربێژ بوو تا ئێستا بینیبێتم. جانجاك ڕۆسۆ وتەنی قسەکانی وەك نامەی خۆشەویستی وابوو: بەشێوەیەك دەستی پێکرد خۆیشی نەیدەزانی دەیەوێت چی بڵێت، کاتێکیش تەواو بوو نەیزانی چی گووت.

لە ساڵی ١٩١٢ەوە، ئەرکی من ئەوەبووە ساڵانە سەرپەرشتی و هەڵسەنگاندن بۆ زیاتر لە ٥ هەزار ووتار بکەم. لەناو هەموو ئەوانەدا کە من سەرپەرشتیم کردوون، یەکێکیان لە هەموویان دیارتر بوو، وەك شاخی ئەڤەرێست بەسەر هەموو ئەوانی دیکدا بەرز بووبوویەوە. هەر بۆیە دەڵێم: *تەنها ئەو قسەکەرانەی خۆیان ئامادە کردووە شایستەی متمانەبەخۆبوونن.* چۆن دەکرێت کەسێك قەڵای ترس بڕوخێنێت ئەگەر

بێتو بە چەکێکی لاوازەوە یان بەبێ گوللە بچێتە مەیدانی جەنگ؟ هەر وەك لینکن دەڵێت: "بە بڕوای من هیچ کات نەبووە بەبێ خۆئامادەکردن قسەم کردبێت و شەرمەزار و خەجاڵەت نەبووبێتم."

ئەگەر دەتەوێت بڕاوبەخۆبوونت زیاد بکەیت، بۆچی شتێك ناکەیت کە دڵنایی و ئاسایشت پێ دەبەخشێت؟ وەك دەوترێت: "خۆشەویستی ڕاستەقینە ترس دووردەخاتەوە." کەواتە خۆئامادەکردنی تەواوەتیش ترس دووردەخاتەوە. دانیاڵ وێبستەر دەڵێت، کاتێك لەبەرچاوی ئامادەبوواندا دەردەکەوم و خۆم نیوە ئامادە کردووە، وادەزانم نیوەی جلەکانیشم لەبەردایە.

## هەرگیز بابەتەکان وشە بە وشە لەبەر مەکە

ئایا مەبەست لە "خۆئامادەکردنی تەواوەتی" ئەوەیە کە قسـەکانت لەبـەر بکـەیت؟ بـۆ وەڵامـی ئـەم پرسـیارە وەك هەورەبروسـکەیەك دەڵـێم **"نەخێر."** زۆربەی ووتاربێژەکان کاتێك هەوڵدەدەن خۆیـان لـەو حاڵەتـە بپارێزن لەبەردەم ئامادەبوواندا بـێ قسـە نـەبن و پـەکیان نەکـەوێت، زۆر بەخێرایی و بەسەر سەردا دەکەونە ناو تەڵەکەوە ـ بابەتەکەیان وشـە بـە وشـە لەبەردەکـەن. کاتێـك قسـەکەر خـوو بـەو ڕەفتـارەوە دەگرێـت و شـتەکان لەبـەر دەکـات، دەبینیـت گـاتێکی زۆر بـەفیڕۆ دەدات لـە خۆئامادەکردنـدا، لـەکاتی قسەکردنیشـدا بـەهیچ جۆرێـك کاریگـەر دەرناکەوێت.

کاتێـك هـانس ڤـۆن کـاڵتنبۆرن، پێشکەشـکای هەواڵـەکانی ئـەمریکا، لـە زانکۆی هارڤارد خوێندکار بوو، بەشداری پێشـبڕکێیەکی کـرد کـە تایبـەت بوو بە شێوازی قسەکردن. کورتـە چـیرۆکێکی بـەناوی "پاشـا بەڕێزەکـە" هەڵبژارد. وشە بە وشە ئەو چیرۆکەی لەبەرکرد و سـەدان جـار دووبـارەی کـردەوە. ڕۆژی پێشـبڕکێکە هـات و ناونیشـانەکەی گـووت: "پاشـا بەڕێزەکە." دوای ئەوە مێشکی هیچی تێدا نـەما. نـەك هیچـی تێـدا نـەما، بەڵکوو لە قسە کەوت، زۆر ترسا. بەناچاری بە مێشکی خـۆی دەسـتیکرد بـە گێڕانـەوەی چـیرۆکەکە. ئـەوەبوو بـوو زۆر سـەرکەوتوو بـوو، لەلایـەن دادوەرانەوە خەڵاتی یەکەمی پێدرا. لەو ڕۆژە بـەدواوە، هـانس ڤـۆن هـیچ کاتێك قسەی نەدەخوێندەوە یان لەبەری نەدەکرد. هەر ئەوەش بـوو بـە

نهێنـی سـەرکەوتنی لـە پیشـەی پێشکەشـکاریدا. هـەموو کاتێـك چـەند تێبینییەکی کەمی دەنووسی و خۆی قسەی بۆ گوێگرانی دەکرد.

ئەو کەسەی قسەکانی دەنوسێتەوە و لەبەریان دەکات کات و وزەی خۆی بەفیڕۆدەدات و کارەسات بۆ خۆی دەخولقێنێت. ئێمە بەدرێـژایی ژیانمـان خۆمـان بەشـێوەیەکی سروشـتی قسـەمان کـردووە، بیرمـان لـە وشـەکان نەکردووەتەوە، بیرمان لە بۆچوونەکانمان کردووەتەوە. ئەگەر بۆچوونە و بیرکردنـــەوەکانمان ڕوونـــبن، بەشـــێوەیەکی سروشـــتی و لائـــیرادی وشەکانیشمان وەك هەناسەدااڵن بەلێشاو دێنە دەرەوە.

تەنانەت وینستۆن چەرچڵیش بەشێوەیەکی نارەحەت ئەو بابەتە فێربـوو. وینستۆن چەرچڵ بە گەنجی قسەکانی دەنووسییەوە و لەبـەری دەکـردن. ئەوەبوو ڕۆژێکیان لەبـەردەم پەرلـەمانتارانی بـەریتانیادا قسـەی دەکـرد، لـەپڕ وەسـتا و هیچـی بـۆ نـەهات. مێشـکی تـەواو قوفـڵ بـوو. زۆر تەریقبوویەوە، شـەرمەزار و زەلیـل بووبـوو! چـەند جارێك کۆتـا ڕسـتەی قسەکانی دووبارە کردەوە. هەم دیسان هیچی بۆ نەهات و سوور هەڵگەڕا، ناچار دانیشت. لەو ڕۆژە بەدواوە، چەرچڵ هیچ قسەیەکی بۆ خەڵك نەکرد کە لەبەری کردبێت.

ئەگـەر وشـە بـە وشـە قسـەکانمان لەبـەر بکـەین، ڕەنگـە لـەکاتی پێشکەشکردن و بینینی ئامادەبوواندا هەمووی لـەبیر بکـەن. ڕەنگە وەك ئامێرێك قسەکانمان بکەین. بۆچی؟ لەبـەر ئـەوەی ئـەو قسانە لـە دڵـەوە نایەن، بەڵکوو لە مێشکمانەوە دێن.

کاتێـك بەتـەنها لەگـەڵ کەسێکدا قسـە دەکـەین، هەمیشـە بـیر لـەو شـتە دەکەینەوە کە دەمانەوێت بیڵێین، بۆیە دەستبەجێ قسـە دەکـەین و بـیر

لە وشە ناکەینەوە. بەدرێژایی ژیانمان هەر وامان کردووە، ئیتر بۆچی ئێستا هەوڵ بدەین بیگۆڕین؟ ئەگەر قسەکانمان بنووسین و لەبەریان بکەین، ڕەنگە هەمان دەردی ڤانس بوشنێل تووشی ئێمەش بێت.

ڤانس بوشنێل دەرچووی بەشی هونەر بوو لە پاریس، دواتر بوو بە جێگری سەرۆکی یەکێك لە گەورەترین کۆمپانیاکانی دەستەبەری کۆمەڵایەتی لە جیهاندا. چەند ساڵێك پێش ئێستا داوای لێکرا قسە بۆ دوو هەزار نوێنەری کۆمپانیا جیاجیاکانی هەموو ئەمریکا بکات. لەوکاتەدا تەنها دوو ساڵ بوو چووبووە ناو پیشەکەیەوە، بەڵام زۆر سەرکەوتوو بوو، بۆیە هەڵیان بژارد ووتارێکی ٢٥ خولەکی پێشکەش بکات.

ڤانس بەو کارە دڵخۆش بوو. پێی وابوو پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە، بەڵام بەداخەوە قسەکانی نووسی و لەبەری کرد. ٤٠ جار لەبەردەم ئاوێنەدا دووبارەی کردەوە، هەموو شتێکی وەك ناوی خۆی لەبەرکردبوو: پێی وابوو هەموو وشە و دەستەواژەیەك و هەموو جوولەکانی تەواون.

بەڵام کاتێك هەستایە سەر پێ بۆ ئەوەی قسەکانی بکات، زۆر ترسا وتی، "لەم کۆبوونەوەدا دەمەوێت..." مێشکی قوفڵ بوو. لە پەشۆکاویدا دوو هەنگاو گەڕایەوە دواوە و جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە. هەم دیسان مێشکی قوفڵ بوو. سێ جار چووە دواوە و هەم دەستی پێکردەوە. ئەو دوانگەی قسەی تێدا دەکرد کەمێك بەرز بوو، لە پشتیشیەوە چۆڵ بوو، هیچ شتێك وەك بەربەست دانەنرابوو. بۆیە چوارەم جار کە چووە دواوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە، لە دوانگەکەوە کەوتە خوارەوە و دیارنەما. ئامادەبووان کردیان بە هاتوهاوار و پێکەنین. پیاوێکی لێبوو ئەوەندە پێکەنی لە کورسییەکەی

کەوتە خوارەوە و لەو ناوەدا بەدەم پێکەنینەوە دەتلایەوە. هەرگیز نە لەوەو پێش نە لەوەو پاش، لە مێژووی ئەو کۆمپانیادا دیمەنی لەو شێوە پێکەنیناوی نەبینرابوو. ئەوەی زۆر بەزمەکەی خۆشتر کرد ئەوەبوو کە ئامادەبووان وایان زانی ئەوە تەنها نواندنێکە! ئەندامە بەتەمەنەکانی ئەو کۆمپانیان تا ئێستاش باس لەو دیمەنە دەکەن.

ئەی قسەکەرەکە چی، ڤانس بوشنێل؟ بوشنێل خۆی بە منی گووت کە ئەوە ناخۆشترین ڕووداو بوو لە ژیانیدا. ئەوەندە هەستی بە ئابڕووچوون کرد کە نامەی دەستلەکارکێشانەوەی خۆی نووسی.

بەرپرسانی ڤانس ڕازی نەبوون بەو داوایە، ڤانس بوشنێلیان قایل کرد نامەی دەستلەکارکێشانەوەی پارچە پارچە بکات. متمانەیان بۆ گێڕایەوە و بڕوای بەخۆی بۆ دروست بوو: لەدوای ساڵێك، ڤانس بوشنێل بوو بە یەکێك لە کاریگەرترین قسەکەر و ووتاربێژەکانی دامەزراوەکەی خۆی، بەڵام هیچ کات قسەی لەبەر نەکردەوە. با ئێمەش لەو ئەزموونەوە پەند وەربگرین.

ئەو ووتاربێژانەی قسەکانیان لەبەر کردووە و دواتر وازیان لەو ڕێگا هەڵەیە هێناوە، ئێستا کەسانێکی سەرکەوتوو، کاریگەر، و چالاکن. ڕاستە کاتێك واز لەو شێوازی قسەکردنە دەهێنیت و شتەکان لەبەر ناکەیت، ڕەنگە هەندێك لە مەبەست و خاڵی گرنگی قسەکانت لەبیر بچێتەوە، بەڵام لانی کەم مرۆڤیت و وەك ڕۆبۆت قسە ناکەیت.

جارێکیان ئەیب لینکن وتی، "حەزم لەوە نییە گوێم لە ووتاری وشك و مردوو بێت. کاتێك گوێ لە کەسێك دەگرم ووتار دەدات، حەز دەکەم بەشێوەیەك ببینم وەك ئەوەی شەڕ لەگەڵ پورەهەنگدا دەکات." لینکن

دەیگووت حەزدەکەم قسەکەر ئەوپەڕی چالاك و پڕ جۆش و خرۆش بێت بۆیە باش ئەوە بزانە کە کەسێك وشەکانی لەبەر کردبێت ناتوانێت بەشێوەیەك ڕەفتار بکات وەك ئەوەی لەگەڵ پورەهەنگدا شەڕ دەکات.

## پێشوەخت بیرۆکەکانت کۆ بکەرەوە و ڕێکیان بخە

ئەی کەواتە کام ڕێگایە بۆ خۆئامادەکردن گونجاوە؟ ئەم ڕێگایە: بە ژیانی خۆتدا بچۆرەوە بزانە ئەزموونێکی گرنگ نادۆزیتەوە کە شتێکی فێرکردبیت، هەروەها ئەو بیرۆکە و بیرکردنەوە، و بیروڕایانە کۆ بکەرەوە کە لەو ئەزموونەوە هەڵقوڵاون و بەدەستت هێناون. ئامادەکاری ڕاستەقینە واتە بەدواداچوون و کۆکردنەوەی زانیارییەکی زۆر لەسەر بابەتەکەت. هەر وەك چارلس براون چەند ساڵێك لەمەوپێش لە سیمینارێکدا لە زانکۆی یەیڵ وتی، "ئەوەندە زانیاری لەسەر ناونیشانەکەت کۆ بکەرەوە، تا وای لێدێت سادە و ئاسان دەبێتەوە بەلاتەوە و کۆنترۆڵی دەکەیت... دواتر هەموو ئەو بیرۆکانە بکە بە نووسین، تەنها بە چەند وشەیەکی کەم، هەر ئەوەندەی ببەتەکەت بیر بخاتەوە لەسەر پەڕەی کۆن بیاننووسەوە ــ ئەنجا کاتێك ویستت بابەتەکانت ڕیز بکەیت، بەئاسانی دەتوانیت ئەو کورتە تێبینییانە ڕێك بخەیتەوە و بابەتەکەت ئامادە بکەیت." ئەم پلانە زۆر قورس نییە، وایە؟ نەخێر قورس نییە. تەنها پێویستی بەوەیە هەندێك وردبیتەوە و بیر لە بابەتێکی دیاریکراو بکەیتەوە.

## لەگەڵ هاوڕێکانتدا ڕاهێنان لەسەر قسەکانت بکە

ئایا دەبێت دوای ئەوەی قسەکانت ڕێکخست، ئەنجا ڕاهێنانیان لەسەر بکەیت؟ بێگومان بەڵێ. ڕێگایەکی هەیە زۆر ئاسان و کاریگەرە. ئەو بیرۆکانە بەکار بهێنە کە بۆ قسەکردنت لەگەڵ هاوڕێکانت هەڵتبژاردوون. کاتێك لەگەڵ هاوڕێیەکتدا دانیشتوویت لەبری ئەوەی خۆت مشەوش بکەیت و لە هەموو بابەتێکدا قسە بکەیت، لەسەر مێزەکە خۆت لار بکەرەوە و شتێکی لەم شێوەیە بڵێ: "دەزانی، جۆن، ڕۆژێکیان ڕووداوێکی سەیرم بەسەر هات. پێم خۆشە بۆت باس بکەم." دەکرێت جۆی زۆر خۆشحاڵبێت بە گوێگرتن. سەرنجی ڕەفتار و پەرچەکردارەکانی بدە. گوێ بگرە بزانە وەڵامی چییە. ڕەنگە بۆچوون و بیرۆکەیەکی سەرنجڕاکێشی هەبێت کە زۆر بەنرخ بێت. ئەو نازانێت کە تۆ ڕاهێنان دەکەیت، بۆیە هەر گرنگ نییە بزانێت.

شالان نێڤنس، مێژوونووسی بەناوبانگ، هەمان ئامۆژگاری بە نووسەران دەدات: "هاوڕێیەکت بگرە کە حەزی لەو بابەتەیە و بەدووروودرێژی ئەوەی فێری بوویت بۆی باس بکە. بەو شێوەیە کاتی گێڕانەوەی بابەتەکە هەندیك تێگەشتنی تازەت بۆ دروست دەبێت کە ڕەنگە سەرەتا بیرت نەبووبێت، تێدەگەیت کام خاڵانە جێگەی مشتومڕن و بەلای بەرانبەرەکەتەوە تێگەشتنیان ئاڵۆزە، هەروەها تێدەگەیت باشترین شێواز بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەت کامەیە."

## سێیەم/پێشوەخت مێشکت بۆ سەرکەوتن ئامادە بکە

لە بەشی یەکەمدا ئەو ڕستەیە بۆ ئەوە بەکارهێنرا تاوەکوو بەرچاوڕوونیت پێبدات سەبارەت بە مەشق و ڕاهێنانەکانی تایبەت بە وتاربێژی، بەڵام ئێستا ئەو ڕستەیە بۆ ئەوەیە بەشێوەیەکی تایبەتتر و وردتر بچیتە ناو بابەتەکەوە و ئەرکی خۆت جێبەجێ بکەیت. بۆ تەواوکردنی ئەو ئەرکەش سێ ڕێگا هەن:

### خۆت نوقمی بابەتەکەت بکە

دوای ئەوەی بابەتەکەت هەڵبژارد و بەپێی پلانێك ڕێکتخست، هەروەها لەگەڵ هاوڕێکانیشتدا ڕاهێنانت لەسەر کرد، هێشتا ئامادەکاری تەواو نەبووە. تەواوی تواناکانت بخەگەڕ بۆ دەرخستن و دۆزینەوەی گرنگیی بابەتەکەت. دەبێت ئەو بیرکردنەوە و بڕوایەت هەبێت کە بەدرێژایی مێژوو بووەتە ئیلهامبەخشی هەموو کەسایەتییە ناودارەکان ـ ئەویش بڕاوابوونە بە ئامانجەکەت. ئایا چۆن ئاگری بڕواکانت لە پەیامەکەتدا گەش دەکەیتەوە؟ بەهۆی ڕوونکردنەوەی بابەتەکەت قۆناغ بە قۆناغ، دەرخستنی مانا قووڵەکانی، ئەنجا بە پرسیارکردن لە خۆت: ئایا ئامادەبووان بە گوێگرتن لە تۆ، چۆن دەتوانن ببن بە کەسێکی باشتر و جیاوازتر؟

### بیر و هۆشت لای ئەو هەستە نەرێنیانە لاببە کە دەکرێت نیگەرانت بکەن

بە نموونە، بیر لەوە بکەیتەوە هەڵەی ڕێزمانی دەکەیت یان بیر لەوە بکەیتەوە لەپڕ لە نیوەی قسەکانتدا تەوابیت و قسەت پێ نەمێنێت،

ئەمانە بیرکردنەوەیکی نەرێنین کە دەکرێت پێش ئەوەی دەستپێ بکەیت، ساردت بکەنەوە و متمانەت بە خۆت نەبێت. بۆیە زۆر گرنگە پێش ئەوەی دەست بە قسەکردن بکەیت، سەرنجت لای خۆت نەبێت. سەرنجت بخە سەر ئەو شتانەی کە قسەکەر و ووتاربێژەکانی دیکە دەیڵێن، لە دڵەوە گوێیان بۆ ڕابگرە، ئەوکات لە گرژی و ئاڵۆزییە دەروونییەکان ڕزگارت دەبێت.

## هانی خۆت بدە

هەموو قسەکەرێك ئەگەر بێتو ئامانجێکی گرنگی نەبێت ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبێت، چەند ساتێك هەست بە گومان و ڕاڕایی دەکات کە هەڵیبژاردووە. لە خۆی دەپرسێت تۆ بڵێی ئەو بابەتە گونجاو بێت، تۆ بڵێی ئامادەبووان بەدڵیان بێت. فریودەخوات و وای لێدێت بابەتەکەی بگۆڕێت. لەو کاتانەدا، کاتێك هەستی نەرێنی خەریکە بڕوابەخۆبوون لەناودەبات، پێویستە هانی خۆت بدەیت و دەروونی خۆت بەهێز بکەیت. بەشێوەیەکی ڕوون و ڕەوان بە خۆت بڵێ کە بابەتەکەت زۆر گونجاوە، لەبەر ئەوەی لە ئەزموونی ژیانی خۆتەوە هەڵقوڵاوە، لە بیرکردنەوەکانی خۆتەوە دەربارەی ژیان سەرچاوەی گرتووە. بە خۆت بڵێ تۆ لە هەموو ئامادەبووان کارامەتریت مادەم دەتوانیت قسە بکەیت، ئەنجا بە خۆت بڵێ: سوێندبێت دەبێت باشترین هەوڵی خۆم بدەم بۆ ئەوەی پەیامەکەم بگەیەنم. تاقیکردنەوە دەروونییە نوێیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە هاندانی خود یەکێکە لە بەهێزترین پاڵنەرەکانی فێربوون.

## چوارەم/ بە بڕواوە ڕەفتار بکە

بەناوبانگترین دەروونناس کە ئەمریکا شانازی پێوە بکات پرۆفیسۆر ویلیام جەیمسە. پرۆفیسۆر ویلیام دەڵێت: "وا دەردەکەوێت ڕەفتارەکان شوێن هەستەکان بکەون، بەڵام لەڕاستیدا ڕەفتار و هەست پێکەوەن: بەڕێکخستنی ڕەفتارەکان، دەتوانین بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەستەکانمان کۆنترۆڵ بکەین.

"کەواتە ئەگەر ئاسوودە نەبووین، تاکە ڕێگا بۆ ئەوەی ئاسوودە بینەوە ئەوەیە، کە بەئاسوودەیی هەستیتە سەر پێ و بەشێوەیەك ڕەفتار و قسە بکەیت وەك ئەوەی زۆر ئاسوودەیت. ئەگەر لەو کاتەدا ئەو ڕەفتارە ئاسوودەی نەکردیت، هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت ئاسوودەت بکات.

"لەبەر ئەوە، بۆ ئەوەی هەست بە ئازایەتی بکەیت، بەجۆرێك ڕەفتار بکە وەك ئەوەی زۆر ئازایت، بە تەواوی هەموو ویست و ئیرادەیەکتەوە هەوڵی خۆت بدە، ئەوکات بووێری و ئازایەتی ڕاستەقینە شوێنی ترسەکەت دەگرێتەوە."

ئەو ئامۆژگارییەی پرۆفیسۆر جەیمس بکە بە ئەڵقەیەك و بیکە گوێت. هەموو کات بەشێوەیەك ڕەفتار بکە وەك ئەوەی خۆت کەسێکی ئازا و بووێریت، بۆ ئەوەی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئامادەبوواندا بووێر و ئازاتربیت. بەڵام دەبێت ئەوەت لەیاد بێت ئەگەر ئامادەکاریت نەکردبێت و بێ بەرنامە هاتبیت بۆ قسەکردن، هەرچی نواندنی دونیا هەیە ئەنجامی بدەیت سوودی نییە، مەگەر لە هەندێ حاڵەتدا ئەویش زۆر کەم. لەبەر ئەوە دەبێت خۆت ئامادەکردبێت و بزانیت باس لە چی دەکەیت، ئەنجا بەگورجوگۆڵی هەنگاو بنێ و هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە و بڕۆرە

مەیدانەوە. باشتر وایە ٣٠ چرکە پێش ئەوەی ڕووبەڕووی ئامادەبووان بیتەوە، هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژیت، چونکە ئۆکسجینی زیاتر وات لێ دەکات بەهێزتر و بوێرتر بیت. یەکێك لە هونەرمەندە گەورەکان هەمووکات دەیگووت: کاتێك هەناسەت زۆرە بەجۆرێك کە بتوانیت ماوەیەکی زۆر ڕایبگریت، ئەوکات نیگەرانی لەخۆیەوە نامێنێت.بەڵێ، کاتێك قسە دەکەیت تەواو خۆت بەرز بکەرەوە و ڕاستەوخۆ تەماشای چاوی ئامادەبووان بکە، ئەنجا ئەوەندە بە متمانەوە قسە بکە وەك ئەوەی هەمووان پارەی تۆ قەرزارن. بەشێوەیەك خەیاڵ بکە هەموویان قەرزاری تۆن و هاتوون داوات لێ بکەن ماوەی قەرزەکەیان بۆ درێژ بکەیتەوە. دڵنیا بە سوودی زۆر لەو جۆرە بیرکردنەوەیە وەردگریت و کاریگەرییەکی زۆر باشی دەبێت.

ڕەنگە بەلاتەوە سەیربێت و بە خۆت بڵێیت چۆن بڕوا بکەم ئەو فەلسەفەیە ڕاستە. چۆن بتوانم بەو شێوەیە خۆم موسەیتەر بکەم. دەی کەواتە قسەی ئەو کابرا ئەمریکییە بەهەند وەربگرە کە هەموو کات هێمای ئازایەتی بووە. ئەو پیاوە کاتی خۆی ترسنۆکترین کەس بوو، بەهۆی مەشق و ڕاهێنانکردن لەسەر بڕوابەخۆبوون، بوو بە یەکێك لە ئازاترین کەسایەتییەکان: هەمیشە لەکاتی قسەکردندا ئامادەبووانی دەوروژاند، کەسێك بوو زۆر لێزان بوو لە کۆنترۆڵکردنی بەرانبەردا و هەمووکات لەکاتی ووتار پێشکەشکردندا دارێکی بەدەستەوە بوو، یەکێك لە قسە بەناوبانگەکانی ئەوەبوو: بەهێمنی قسە بکە بەڵام با دارێکی گەورەت پێ بێت. ئەو کەسەش سیۆدەر ڕۆزەفێڵت بوو ـــ سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لە ژیاننامەکەیدا خۆی دان بەوەدا دەنێت و دەڵێت: "کاتی خۆی گەنجێکی گەمژە و کەللەڕەق بووم. سەرەتا هەم شەڵەژاو و هەم بەگومان بووم لە تواناکانی خۆم. بۆیە پێویست بوو نەک تەنها لەڕووی جەستەییەوە، بەڵکوو لەڕووی ڕۆحی و دەروونیشەوە بەشێوەیەکی زۆر چڕوپڕ مەشق و ڕاهێنان بکەم."

خۆشبەختانە هەموو ئەوەی بۆ باس کردووین کە بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە بەدەستی هێناوە. بەم شێوەیە نووسیویەتی: "کاتێک گەنج بووم، بابەتێکم لە یەکێك لە کتێبەکانی ماریات خوێندەوە کە هەموو کاتێک سەرنجی ڕادەکێشام و سەرسام دەبووم پێی. لەو بەشەدا، کاپتنی کۆمەڵێك جەنگاوەری بەریتانی باسی ئەوەی بۆ پیاوەکانی دەکرد کە چۆن پاڵەوانەکان چاونەترس و نەبەز دەبن و لە هیچ شتێك ناترسن. قسەکانی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، بەو شێوەیە هانی جەنگاوەرەکانی دەدا و دەیگووت: 'هەموو کەسێك لەسەرەتادا بۆ ئەنجامدانی هەر شتێك ترسێکی هەیە، بەڵام تاکە ڕێگە ئەو کەسە بتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات و بەهێز بێت ئەوەیە، کە بەشێوەیەك ڕەفتار بکات وەك ئەوەی هیچ ترسی نییە. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك بەوشێوەیە ڕەفتاری کرد، ئەوکات نواندنەکەی دەبێت بە شتێکی ڕاستی. بۆیە کاتێك ئەو کەسە هەست بە ئازایەتی ناکات، وا خۆی پیشان بدات کەسێکی چاونەترسە، ئەوکات دەبێت بە کەسێکی ئازاو چاونەترس.'

"ئەمە ئەو تیۆرەیە کە من لەسەری ڕۆشتم. زۆر شت هەبوون لەسەرەتادا لێیان دەترسام، هەر لە ورچی گەورەوە تا دەگات بە ئەسپ و تەقەمەنی و چەك، بەڵام بەهۆی ئەوەی وا خۆم پیشان دەدا کە ناترسم، وردە وردە

ترسم نەما. زۆربەی کەسانی دیکە ئەگەر بیانەوێت دەتوانن هەمان ئەزموون دووبارە بکەنەوە."

بەهۆی زاڵبوون بەسەر ترسی قسەکردن بۆ خەڵك، گۆڕانکاری لە هەموو ئەو شتانەدا دەکەین کە ئەنجامیان دەدەین. ئەو کەسانەی بەگوێی سیۆدەر ڕۆزەڤێڵت دەکەن، تێدەگەن کەسانێکی باشترن بەراورد بە دەوروبەریان. تێدەگەن سەرکەوتنیان بەسەر ئەو ترسەدا لە بەرگی خۆیان دەری هێناوەن و گەیاندوونی بە ژیانێکی باشتر و تەواوتر.

فرۆشیارێك نوسیبووی: "دوای ئەوەی چەند جارێك لەسەر پێیەکانی خۆم ڕاوەستام و لەبەردەم پۆلەکەمدا قسەم کرد، دەمزانی لەمەوبەدوا دەتوانم لەگەڵ هەموو کەسێکدا مامەڵە بکەم و قایلی بکەم. بەیانییەکیان چوومە بەردەم دەرگای ئۆفیسی یەکێك لە موشتەرییەکانم کە کەسێکی زۆر کەللەڕەق بوو، بەئەستەم شتی دەکڕی، پێش ئەوەی بڵێ 'نەخێر' نموونەی بەرهەمەکانم لەسەر مێزەکەی بڵاوکردەوە، ئەوەبوو زۆرترین شتی کڕی."

خانمێك کە ژنیماڵەوە بوو، بە یەکێك لە نوێنەرەکانمی گووتبوو: "نەمدەوێرا دراوسێکانم بانگهێشتی ماڵەوە بکەم، دەترسام قسەم پێ نەبێت دوو دەمەتەقێیان بۆ بکەم. دوای ئەوەی چەند خوولێکم بینی و لەسەر پێیەکانی خۆم وەستام، ئەو سەرکێشییەم کرد و یەکەم میوانداریم ڕێکخست، سوپاس بۆ خوا زۆر سەرکەوتوو بووم. هیچ کێشەم نەبوو لە قسەکردن و گەرمکردنی کۆڕەکە (مجلیسەکە)."

ئەم کەسانە لەوە تێگەیشتن زۆر ئاسان دەتوانن بەسەر ترس و نیگەرانییەکاندا زاڵبن و کەسانێکی سەرکەوتووبن، ئەمە لەکاتێکدا پێشتر

زۆر لـەوە دەترسـان شکسـت بهێـنن. بۆیـە تـۆش بەهـەمان شـێوە لـە داهـاتوودا تێدەگـەیت قسـەکردن بـۆ خـەڵکی و ووتاربێـژی هەسـتی بڕوابـەخربوونت پـێ دەبەخشـن. توانـای چارەسـەرکردنی کێشـە و گیروگرفتەکانی ژیانت پێدەبەخشن. ئەنجا دەڵێیت: ئا ئەمە بوو مـن لێـی دەترسام؟

## ((بەشی سێیەم))

# ڕێگایەکی خێرا و ئاسان بۆ قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر

---

من زۆر بەدەگمەن لە ڕۆژدا تەماشای تەلەفزیۆن دەکەمن بەڵام هاوڕێیەکم داوای لێکردم تەماشای بەرنامەیەکی ئێواران بکەم کە تایبەت بوو بە ژنی ماڵەوە. بەرنامەکە ئاستێکی زۆر بەرزی هەبوو، هاوڕێکەشم سووربوو لەسەر ئەوەی تەماشای بکەم، چونکە پێی وابوو ئەو بەشەی بەرنامەکە کە ئامادەبووان بەشداری دەکەن سەرنجی من ڕادەکێشێت. لەڕاستیدا وابوو سەرنجی ڕاکێشام. چەند جارێك سەیرم کرد، زۆر سەرسام بووم بەوەی پێشکەشکارەکە زۆر سەرکەوتوو بوو لەوەی ئامادەبووان بڕاکێشێت بۆ سەر ستەیج (دوانگە) و قسەی پێدەدەکردن. ئەوە زۆر سەرنجی ڕاکێشام. ئەو کەسانەی بەشدارییان دەکرد دیاربوو قسەکەر و ووتاربێژی کارامە نەبوون. بەهیچ شێوەیەك ڕاهێنانیان لەسەر هونەری گفتوگۆکردن نەکردبوو. هەندێکیان ڕێزمانێکی هەڵە و وشەی لاوازیشیان بەکاردەهێنا، بەڵام زۆر سەیر بوو هەموویان حەزیان دەکرد بەشدار بن. کاتێك قسەیان دەکرد، ترسیان لە چاوی کامێراکان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرنجی ئامادەبووانیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا.

باشە چۆن؟ لەبەر ئەوەی خۆم ماوەی چەندین ساڵە ئەو تەکنیکانە بەکاردەهێنم کە لەو بەرنامەدا بەکارهێنرا، وەڵامەکەی باش دەزانم. ئەو کەسانەی لەو بەرنامەدا بوون، کەسانی سادە و ئاسایی بوون، سەرنجی هەموو بینەرانی ووڵاتیان بەلای خۆیاندا ڕاکێشا: باسی خۆیان دەکرد،

باسی ناخۆشترین ساتەکانی خۆیان دەکرد، باسی خۆشترین کاتەکانی ژیانیان دەکرد، یان باسی ئەوەیان دەکرد چۆن هاوسەرەکانیان ناسیووە. وەك نووسینی ڕاپۆرت بیریان لە پێشەکی و ناوەڕۆك و دەرەنجام نەدەکردەوە. گرنگییان بە شێوازی قسەکردن و ڕێکخستنی ڕستەکانیان نەدەدا. کەچی ئامادەبووان دەستخۆشییان لێدەکردن و تەواو سەرنجیان لای قسەکانیان بوو. سێ یاسا هەن تایبەتن بە ڕێگایەکی خێرا و ئاسان بۆ ئەوەی فێری قسەکردن بیت بۆ خەڵك، بەنیسبەت منەوە، ئەم بەرنامەیە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ سەلماندنی یەکەم یاسای ئەو سێ یاسایە. ئەمانەش سێ یاسا بنچینەییەکەن:

**یەکەم/ باسی شتێك بکە کە ئەزموونی خۆتە یان لەبارەیەوە خوێندووتە**

ئەو ژن و پیاوانەی بە بەسەرهاتەکانیان بەرنامەکەیان سەرنجڕاکێش کردبوو، تەنها باسی ئەزموونی خۆیان دەکرد. باسی شتێکیان دەکرد کە دەیانزانی چییە. بهێنە پێش چاوت ئەو بەرنامە چەند بێتام و ناخۆش دەبوو، گەر ئەو کەسانە داوایان لێ بکرایە پێناسەیەکی بیری کۆمەنیزمی بکەن، یان داوایان لێ بکرایە باسی دامەزراوە حکومییەکانی وڵات بکەن. بێگومان زۆر بێتام و بێزارکەر دەبوو. دەی لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر قسەکەر و ووتاربێژ لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا هەمان ئەو هەڵەیە دەکەن. هەوڵ دەدەن باس لە بابەتێك بکەن کە زانیارییان نییە لەسەری یاخود زانیارییان زۆر کەمە و کەمترین گرنگییان پێداوە. بابەتێکی وەك دیمۆکراسی، نیشتیمان پەروەری، یان دادپەروەری هەڵدەبژێرن، ئەنجا دوای چەند کاتژمێرێك لە گەڕانی چڕوپڕ بەناو کتێب و وتەی ناودارانـدا

بەپەلە و بەشپرزی هەندێك بابەت دەهێنن، کە بەباشی لەبیریان نییە یان کاتی خۆی لە زانکۆ خوێندوویانە، ئەنجا زۆر پەلەیانە ووتارەکەیان پێشکەش بکەن، ووتارێك کە جگە لە درێژی و زۆری هیچ شتێکی لەوانی دیکە جیاواز نییە. هەرگیز ئەو جۆرە ووتاربێژانە ڕۆژێك بەخەیاڵیاندا نەهاتووە کە دەکرێت گوێگر حەزی لە بابەتی ڕاستی (واقیعی) بێت.

ساڵانێك بەر لە ئێستا، لە یەکێك لە خولەکانی دەیڵ کارنگی لە شیکاگۆ، خوێندکارێکی خولەکە بەم شێوەیە دەستی پێ کرد: "ئازادی، یەکسانی، برایەتی. ئەمانە گەورەترین چەمکن لە فەرهەنگی مرۆڤایەتیدا. بەبێ ئازادی، ژیان مانایەکی نییە. بهێنە پێش چاوت چی جۆرە ژیانێکە گەر لە هەموو لایەکەوە ئازادییەکانت زەوت بکرێن."

تەنها تا ئەوێی گووت، ڕاهێنەرەکەی بەشێوەیەکی ژیرانە وەستاندی و پرسیاری ئەوەی لێکرد بۆچی بڕوای بەو قسانە هەیە کە ئێستا وتنی. پرسیاری لێکرد ئایا هیچ بەڵگەیەك یان هیچ ئەزموونێکی کەسی پێیە کە پاڵپشتیی ئەو قسانەی بکات؟ ئەوەبوو بەسەرهاتێکی زۆر سەرنجڕاکێشی گێڕایەوە.

کاتی خۆی لە سوپای فەرەنسا سەرباز بوو. باسی ئەو سوکایەتییەی بۆ دەکردین کە لەلایە ڕژێمی نازییەکانەوە بەسەر خۆی و خێزانەکەیدا هات. بەزمانێکی ڕوون و بەوردی باسی ئەوەی بۆ کردین کە چۆن بە ترس و بەنهێنی ژیاوە، ئەنجا باسی ئەوەی کرد چۆن بە ترس و ناڕەحەتییەکی زۆرەوە لەدەستی پۆلیس هەڵهاتووە و خۆی گەیاندووە بە ئەمریکا. لە کۆتاییدا وتی: "کاتێك ئەمڕۆ هاتم بۆ ئەم ئوتێلەی ناوچەی میشیگان، ئازاد بووم لەوەی بەدڵی خۆم بێم و بڕۆم. بەلای پۆلیسێکدا تێپەڕیم، هەر

سەیریشی نەکردم. بەبێ ئەوەی داوای ناسنامەم لێ بکەن هاتمە نێو ئەم ئوتێلەوە، کاتێکیش ئەم کۆبوونەوەیە تەواو دەبێت، هەرکوێم بوویت لەم شیکاگۆدا دەتوانم بۆی بڕۆم. بڕوام پێ بکەن ئازادی شایەنی ئەوەیە شەڕی بۆ بکەین." کاتێك تەواو بوو، هەموو ئامادەبووان هەستانە سەر پێ و دەستخۆشییان لێ دەکرد.

## پێمان بڵێ ژیان چی فێری تۆ کردووە

ئەو قسەکەر و ووتاربێژانەی کە باس لەو شتانە دەکەن ژیان فێری کردوون، بەردەوام سەرنجی گوێگرەکانیان بۆلای خۆیان ڕادەکێشن. لە ئەزموونی خۆمەوە ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە ووتاربێژان بەئاسانی ئەم بۆچوونەیان پێ قەبووڵ ناکرێت ـــ خۆیان دەپارێزن لە بەکارهێنانی ئەزموونی تاکە کەسی خۆیان، وادەزانن شتێکی بێ کەڵکە یان پێیان وایە زۆر سنوردارە. زیاتر پێیان خۆشە باس لە بیرۆکە و چەمکە گشتییەکان و بنەما فەلسەفییەکان بکەن، کە بەداخەوە ئەو بابەتانە هەواکەی زۆر لە ئاستی مرۆڤی ئاسایی بەرزترە تا بتوانێت هەناسەی تێدا بدات. ئەوان باسی سەردێڕەکانمان بۆ دەکەن و ئێمە برسیی هەواڵەکانین. هیچ کەسێك لە ئێمە ڕقی لەوە نییە گوێ بۆ سەردێڕەکان بگرێت، ئەگەر کەسێکی کارامە و شارەزا پێشکەشی بکات. مەبەستەکە ئەوەیە: باسی ئەو شتە بکە کە ژیان فێری کردوویت ئەوکات منیش دەبمە گوێگرێکی دڵسۆزت.

دەگووترێت ئیمێرسن هەمیشە ئامادە بووە گوێ لە هەموو کەسێك بگرێت، بەبێ گوێدان بە ئاستی کەسەکە، چونکە پێی وابوو لە هەموو کەسێکەوە دەکرێت شتێك فێربێت. ڕەنگە من زیاتر لە هەر کەسێکی

دیکە گوێم لە ووتار و قسەی گەنجان گرتبێت، دەتوانم بڵێم هیچ کاتێك گوێم لە ووتارێك نەبووە کە قسەکەر باسی شتێکی ژیانی خۆی کردبێت و ناخۆش بووبێت.

بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی: چەند ساڵێك لەمەوپێش، یەکێك لە ڕاهێنەرەکانمان خولێکی لەسەر ووتاربێژی بۆ ئەفسەرانی بانکی نیویۆرك کردەوە. بەشێوەیەکی سروشتی ئەو کەسانەی لەو خولەدا بوون داواکارییان زۆر بوو لەسەر ئەوەی کاتیان کەمە و بواریان نییە بەباشی خۆیان ئامادە بکەن. ئەم کەسانە بەدرێژایی ژیانیان بیریان لە ڕاوبۆچوونەکانی خۆیان دەکردەوە، پەرەیان بە بیروڕای خۆیان دەدا، شتەکانیان لە گۆشەنیگای خۆیانەوە دەبینی، بەو ئەزموونەوە دەژیان کە بە گەنجی وەریان گرتبوو. ماوەی چل ساڵ خەریکی کۆکردنەوەی بابەت و سەرچاوەبوون بۆ بەهێزکردنی توانای قسەکردنیان.

ڕۆژێکی هەینی پیاوێکی بەڕێز بەناوی بەڕێز جاکسن کە کارمەندی بانکەکە بوو کەمێك زوو هاتبوو بۆ بانك. دەزانی چی کرد؟ لە ئۆفیسەکەی چووە دەرەوە و نوسخەیەك لە ڕۆژنامەی فۆربس'ی هێنا، بۆ خۆی دانیشت و بابەتێکی خوێندەوە بەناونیشانی، 'تۆ تەنها ١٠ ساڵت هەیە بۆ سەرکەوتن'.

ئەمەی تەنها لەبەر ئەوە نەکرد کە حەزی لێی بێت، بەڵکوو بۆ ئەوە بوو بتوانێت ئەو کاتە پڕ بکاتەوە کە بۆ قسەکردن پێی درابوو. دوای کاتژمێرێك، هەستایە سەر پێی و هەوڵی دا بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و قایلکەر لەسەر ناوەڕۆکی ئەو بابەتە قسە بکات.

دەزانیت دەرئەنجامەکەی چی بوو؟ ئەوەی خوێندبوویەوە بۆی هەرس نەکرا، نەیتوانی بەتەواوی لە شتەکان تێبگات. هیچ پەیامێك لە قسەکانیدا بەدی نەدەکرا: ئەمەش بەتەواوەتی لە شێوازی ڕەفتارکردن و قسەکردنییەوە هەستی پێ دەکرا. بەردەوام دەیگووت نووسەر وەهای گووت، نووسەری ئەمەی گووت.

دوای تەواوبوونی قسەکانی، ڕاهێنەرەکەی وتی: "بەڕێز جاکسن، ئێمە بایەخ بە کەسێکی نادیار نادەین کە ئەو بابەتەی نوسیووە، ئەو ئێستا لێرە نییە. خۆ ناتوانین بیبینین، بەڵام ئێمە تۆ دەبینین، بایەخ بە خۆت و بیرکردنەوەکانت دەدەین. پێمان بڵێ ڕای خۆت چۆنە، نەك قسەی کەسێکی دیکەمان بۆ باس بکەیت. زیاتر خۆت لەو بابەتەدا دەور ببینە. ئایا دەکرێت هەفتەی داهاتووش هەمان بابەت باس بکەیت؟ جارێکی دیکە ئەو بابەتە بخوێنەوە، لە خۆت بپرسە بزانە هاوڕایت لەگەڵ نووسەر یان یاخود نا. ئەگەر هاوڕایت، بە ئەزموونێکی خۆت هۆکاری هاوڕابوونەکەت ڕوون بکەرەوە. ئەگەر هاوڕا نیت، پێمان بڵێ بۆ. با ئەم بابەتە ببێتە خاڵی دەستپێك و قسەی خۆت بکەیت."

بەڕێز جاکسن دووبارە بابەتەکەی خوێندەوە و گەشتە ئەو بڕوایەی کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ نووسەردا هاوڕا نییە. بە ڕابردووی خۆیدا گەڕا بۆ ئەوەی نموونە بۆ ڕایەکانی خۆی بهێنێتەوە و بیسەلمێنێت بۆچوونەکەی ڕاستە. هەفتەی دواتر هاتەوە و قسەکانی بەشێوەیەك پێشکەش کرد کە پڕبوو لە بیروڕای خۆی، کۆمەڵە بیروڕایەك کە لەسەر بنەمای ڕابردوو و ئەزموونی خۆی بۆی دروست بووبوو. لەبری بابەتێکی دووبارەی بەسەرچوو، لە کۆگاکانی خۆیەوە کۆمەڵێك زانیاری و بیرۆکەی زۆری بۆ

ناردین، کۆمەڵە زانیارییەکی بەتام و بۆ. من ئەم بابەتە بۆ تۆ بەجێ دەهێڵم، خۆت بڕیار بدە کام قسانە زیاتر کاریگەرییان لەسەر گوێگر دروست کرد.

## لەناو ئەزموونەکانتدا بەدوای بابەتدا بگەڕێ

جارێکیان داوا لە هەندێك لە ڕاهێنەرەکانمان کرا لەسەر پەڕەیەك بنووسن: بەڕای ئەوان گەورەترین کێشە چی بووە لەبەردەم بوونیان بە ووتاربێژ. کاتێك پارچە کاغەزەکان کرانەوە و تەماشای وەڵامەکان کرا، دەرکەوت کە ئەم کێشەیە، "فێرخوازە سەرەتاییەکان فێر بکەین لەسەر بابەتێکی شیاو قسە بکەن" زۆرترین جار لە خوولەکاندا ڕووبەڕووی ڕاهێنەرەکان بووەتەوە.

ئایا بابەتی شیاو چییە؟ ئەوکاتە بابەتەکەتپێی دەوترێت شیاو بۆ قسەکردن کە لەگەڵیدا ژیابیت، خودی خۆت ئەزموونت کردبێت، بیرکردنەوە و تێگەشتنی خۆتی تێکەڵ بکەیت و بیکەیت بە هی خۆت. ئەی ئایا چۆن بابەت و ناونیشان بدۆزیتەوە؟ زۆر ئاسانە، بەهۆی چوونە ناو یادگارییەکانتەوە و گەڕان بەدوای ئەو لایەنە گرنگانەدا کە کاریگەری لەسەرت هەبووە. ساڵانێك لەمەو پێش، سەرژمێرییەکمان کرد و بەدواداچوونمان بۆ ناونیشانەکان کرد بۆ ئەوەی بزانین کام بابەت لە خولەکانماندا زۆرترین سەرنجی ئامادەبوویان بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. بۆمان دەرکەوت ئەو ناونیشانانەی کە لای ئامادەبووان زۆر پەسەند بوون، ئەو بابەتانە بوون کە ئەزموونی قسەکەر خۆی بوو، لەوانەش:

*سالانی منداڵی و گەورەبوون.* هەمیشە ئەو بابەتانەی باس لە خێزان، یادگارییەکانی سەردەمی منداڵی، سەردەمی مەکتەب دەکەن، سەرنجی گوێگر ڕادەکێشن، لەبەر ئەوەی زۆربەمان حەزمان لەوەیە بزانین کەسانی دیکە چۆن تووشی بەربەست بوونەتەوە و بە چی شێوەیەک توانیویانە سەرکەوتووبن.

هەرکاتێك بۆت کرا، لە قسەکانتدا باسی بابەت و نموونەکانی سەردەمی منداڵیت بکە. بەڵام ئایا چۆن دەزانیت کەسانی دیکە ئەو شتەیان پێ خۆشە کە بە منداڵی یان بە گەنجی بەسەرتدا هاتووە؟ ئاماژەیەك بۆ ئەمە هەیە. ئەگەر لە یادگارییەکانتدا شتێك هەبوو داوی تێپەڕبوونی چەندین ساڵ هێشتا هەر لەیادت مابوو، ئەوە گرەنتیی ئەوەی هەیە بەدڵی گوێگر دەبێت.

*ئاستەنگەکانی ڕابردوو.* ئەم لایەنە خواستێکی زۆری لەسەرە. بەهۆی گێڕانەوەی چیرۆکی خۆت و باسکردنی ئەو هەوڵانەی کە بۆ سەرکەوتن و تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان داوتن، سەرنجی هەمووان بەلای خۆتدا ڕاکێشیت. بە نموونە: باس لەوە بکە چۆن فلان ئیشت دەستکەوت. ئەو هۆکارانە چی بوون بەهۆیەوە ئیشت دەستکەوت؟ باسی کۆست و بەربەستەکانت، هیواکانت، و سەرکەوتنەکانت بکە. باسکردنی ژیانی ڕاستەقینەی خۆت باشترین تەکنیکە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی گوێگر.

پسپۆڕییەکەت. دوای چەندین ساڵ لە کارکردن لە یەك بواردا، ئێستا پسپۆڕیت تیایدا. بۆیە ئەگەر لەسەر بنەمای ئەزموونی خۆت باس لە لایەنە جیاوازەکانی پیشەکەت بکەیت، بەجۆرێك لە جۆرەکان دەتوانیت دڵنیابیت سەرنجی ئامادەبووان ڕادەکێشیت.

*ئەزموونێکی نائاسایی.* ئایا تا ئێستا کەسێکی بەناوبانگت بینیوە؟ ئایا جەنگت بینیوە کە تیایدا تۆپ و تەیارە بەسەرتدا فڕیبێت؟ ئەم جۆرە ئەزموونانە باشترین بابەتن قسەیان لەسەر بکەیت.

*بیروڕای خۆت.* ڕەنگە کات و وزەیەکی زۆرت بۆ ئەوە تەرخان کردبێت بابەتێکی گرنگ هەڵبژێریت. ئەگەر ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی خوێندنەوە و گەڕان بیت لەسەر ئەو بابەتەی هەڵت بژاردووە، ئەوکات توانا و کارامەیی ئەوەت دەبێت قسەی لەسەر بکەیت، بەڵام کاتێك قسە لەسەر بابەتەکەت دەکەیت، دڵنیا بە لەوەی بیروڕای خۆتی لەسەر بڵێیت. گوێگر تام لە قسەیەك ناکات کە زۆر گشتی بێت. تکایە وا تێمەگە خوێندنەوەیەکی سەرپێیی گۆڤار و ڕۆژنامەکان بەو مانایە دێت ئامادەیت قسە لەسەر ئەو بابەتانە بکەیت. ئەگەر لەسەر ئەو بابەتە تەنها کەمێك زانیاریت لە گوێگرەکانت زیاترە، باشترین شت ئەوەیە باسی نەکەیت. لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر ساڵانێکە سەرقاڵی خوێندنەوە و کۆکردنەوەی زانیاریت لەسەر چەند بابەتێك، ئەوە گومانی تێدا نییە ئەوانە باشترین بابەتن قسەیان لەسەر بکەیت. لەبەر ئەوە لێی دڵنیا بە و هیچ لێی مەترسە.

وەك لە بەشی دووەمدا ئاماژەی پێدرا، خۆئامادەکردن تەنها بریتی نییە لەوەی هەندێك وشە و دەستەواژە بخەیتە سەر پارچە کاغەزێك، یان چەند ڕستەیەك لەبەر بکەیت و بەس. بریتیی نییە لە هەڵبژاردنی چەند بیرۆکەیەکی دووبارە و کۆن کە لە خوێندنەوەیەکی خێرا و سەرپێیی کتێب و ڕۆژنامەکانەوە وەرتگرتوون. بەڵکوو بریتییە لەوەی بچیتە نێو قوڵایی دڵ و مێشکتەوە و ئەو بیرکردنەوە و بیروڕایانە دەربهێنیت کە ژیان بۆی بەجێ هێشتوویت. هیچ کات گومان لەوە نەکەیت لەو شوێنەدا

ـ مێشك و دڵ ـ بابەتەکانی تۆی تێدا نییە. بێگومان تێیدایە! چەند گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی لێیە چاوەڕوانی تۆن بیاندۆزیتەوە. ئەو بابەتانەی لە مێشك و دڵ و دەروونتان بە شتێکی زۆر شەخسی و تایبەتیان مەزانە، مەڵێ گوێگر پێی هیچە. من وەك خۆم زۆر بەو جۆرە بابەتانە سەرسام بووم و سەرنجیان ڕاکێشاوم، زۆر سەرنجڕاکێشتر و کاریگەرتر بوون لە قسەی ووتاربێژە ناودارەکان. تەنها بە باسکردنی شتێك کە کارامە و شارەزای تیایدا، دەتوانیت دووەم بنچینە بەدەست بهێنیت بۆ ئەوەی بە ڕێگایەکی خێرا و ئاسان گفتوگۆیەکی کاریگەر بکەیت.

ئەمەش بنچینەی دووەم:

**دووەم/ دڵیا بە لەوەی زۆر حەزت لە بابەتەکەی خۆتە**

هەموو ئەو ناونیشان و بابەتانەی کە تۆیش و منیش کارامە و شارەزاین تیایدا سەرنجڕاکێش نین. بە نموونە، من زۆر شارەزا و کارامەم لە قاپ شۆریندا، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت ناتوانم بە حەز و شەوق و زەوقەوە باسی ئەو بابەتە بکەم. ئەوەی ڕاستی بێت، حەزم لێیە هە بیریشی لێ نەکەمەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گوێم لێ بووە زۆرێك لە ژنانی ماڵەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو بابەتە قسەیان کردووە ـ قاپ شۆردن و بابەتی ناوماڵ. ئەمەش یان لەبەر ئەوەیە لە ناخی خۆیاندا زۆر ڕقیان لەوەیە هەر قاپ دەشۆرن هەر نابڕێتەوە، یان ئەوەتا بەشێوەیەکی لێزانانە خۆیان لەو ئیشە دزیوەتەوە، بۆیە ئاوا بەتامەزرۆییەوە باسی دەکەن.

پرسیارێك هەیە دەتوانیت بەهۆیەوە بزانیت ئەو بابەتەی هەڵتبژاردووە تا چەند شیاوی باسکردنە: ئایا ئەگەر کەسێك هەستێتە سەر پێ و ڕاستەوخۆ دژی بۆچوونەکەت بێت، هەوڵ دەدەیت بەرگری لە ڕایەکەت بکەیت؟ ئەگەر ئامادەیت بیت ئەوە بکەیت، ئەوە بابەتەکەت شیاوی باسکردنە.

بەم دواییانە تەماشای ئەو تێبینیانەم دەکرد کە ساڵی ١٩٢٦، لەدوای سەردانەکەم بۆ کۆبوونەوەی وڵاتانی هاوپەیمان لە جنێف - سویسرا، نوسیبووم. ئەمە بەشێکیەتی: "دوای ئەوەی سێ چوار کەس بەساردوسڕی قسەیان کرد و تەواو بوون، جۆرج فۆستەر کە لە کەنەداوە هاتبوو، دەستی کرد بە قسەکردن. سەرنجم دا ئەوپەڕی ئاسوودە بوو، هیچ کاغەز و تێبینییەکیشی پێ نەبوو. بەدڵ لەناو ئەو شتادا بوو کە باسی دەکرد، شتێکی پێ بوو زۆر تامەزرۆ بوو پێمان بڵێت. وەك ڕۆژی ڕووناك دیار بوو کە ئەو کابرا زۆر ئەو قەناعەت و بیرکردنەوانەی بەلاوە گرنگ بوو، زۆر حەزی دەکرد گوێگرەکانی بگەیەنێت. ئەو بنەما و ڕێسایانەی کە هەموو کات لە وانەکانمدا باسم دەکردن و بەلامەوە پەسەند بوون، زۆر بەجوانی لەو ووتارەدا بەرجەستە بووبوون."

بیشۆپ فولتن لە کتێبەکەیدا – ژینێك شایستەی ژیان – نوسیوویەتی: "لە زانکۆ هەڵبژێردرام بۆ قسەکردن لە دیبەیتێکدا، شەوێك پێش دیبەیتەکە، پرۆفیسۆری سەرپەرشتیاری دیبەیتەکە بانگی کردم بۆ ژوورەکەی خۆی و سەرزەنشتی کردم. وتی، تۆ زۆر نەزانیت. لە مێژووی ئەم زانکۆدا کەسێکی دیکە نەبووە لە تۆ خراپتر. منیش هەوڵم دەدا خۆم ڕێك بخەم و وتم: زۆر باشە، گەر دەزانی من ئەوەندە خراپم بۆچی منت خستە ناو

تیمەکەوە؟ وەڵامی دایەوە و وتی، لەبەر ئەوەی تۆ دەتوانیت بیر بکەیتەوە: نەك لەبەر ئەوەی دەتوانیت قسە بکەیت. بڕۆ ئەو سوچە و ئەو بەشەی هی تۆیە بیبە و بەوردی بیخوێنەوە. نزیکەی کاتژمێرێك بەشەکەی خۆمم دەخوێندەوە و دوبارەم دەکردەوە، لە کۆتاییدا وتی، ئایا هیچ هەڵەیەك دەبینیت؟ نەخێر. هەم دیسان کاتژمێر و نیوێك خوێندمەوە، بوو بە دوو کاتژمێر، دوو کاتژمێر و نیو، لە کۆتاییدا تەواو شەکەت بووم. پڕۆفیسۆر وتی، هێشتا نازانیت چی شتێکت هەڵەیە؟

"دوای دوو کاتژمێر و نیو خوێندنەوە، ئەنجا هەستم پێ کرد. گووتم: بەڵێ، تێگەشتم کە گەرموگوڕ نیم، لە قسەکاندا خودی خۆم نیم. بەشێوەیەك قسە ناکەم وەك ئەوەی لە دڵەوە مەبەستم بێت."

لەو خاڵەوە بیشۆپ فوڵتن وانەیەك فێر بوو کە هەمیشە لەیادییەتی: لە ناو قسەکانیدا توایەوە، بەجۆش و خرۆشەوە باسی بابەتەکەی دەکرد. ئەنجا پڕۆفیسۆرەکەی وتی، "ئێستا ئامادەیت بۆ قسەکردن!"

کاتێك بەشداربوویەکمان دەڵێت، "حەزم لە هیچ شتێك نییە، ژیانێکی زۆر ناخۆشە،" ڕاهێنەرەکانمان پرسیاری لێدەکەن بزانن لە کاتە بەتاڵەکاندا چی دەکات. یەکێك تەماشای فیلم دەکات، یەکێك یاری دەکات، یەکێکی دیکە سەرقاڵی حەوشەی ماڵەکەیەتی. پیاوێك وتی پاکەتی شقارتە کۆدەکاتەوە! کاتێك ڕاهێنەرەکە پرسیاری ئەو خووە سەیرەی لێکرد، هێواش هێواش کەوتە قسە و گەرم بوو. دواتر وای لێهات کاتێك باسی ئەو ژوورەی دەکرد کە شقارتەکانی تێدا هەڵگرتووە، بەشێوەیەکی بەرچاو جوڵە و زمانی جەستەی بەکاردەهێنا. بە ڕاهێنەرەکەی گووت لە زۆربەی وڵاتنی دونیاوە پاکەتی شقارتەی

کۆکردووەتەوە. کاتێك تەواو جۆش و خرۆشی زیادی کرد، ڕاهێنەرەکەی وەستاندی. "بۆچی باسی ئەم بابەتەت بۆ نەکردین؟ بەلای منەوە زۆر سەرنجڕاکێشە." ئەویش وتی پێم وانەبووە کەس حەزی لێی بێت! ئەم پیاوە چەندین ساڵ بەدوای خولیایەکی خۆیەوە بووە، کەچی ئەوەندە بە گرنگی نەزانیوە بیکات بە بابەتێك وقسەی لەسەر بکات. ڕاهێنەرەکە بۆ ئەو پیاوەی ڕوون کردەوە: تاکە ڕێگا بۆ ئەوەی بایەخ و گرنگیی بابەتێکی پێ بپێویت ئەوەیە لە خۆت بپرسە تا چەند حەزت لەو بابەتەیە. تا چەند حەزت لەو بابەتە بێت، ئەوەندەش بەنرخ و گرنگە و شایەنی باسکردنە. ئەو شەوە ئەو کابرایە بەوپەڕی گەرموگوڕییەوە باسی خۆی دەکرد، دوای ماوەیەك بیستم ناوبانگێکی ناوخۆیی دەرکردووە و لە چەند یانە و کۆبوونەوەیەك قسەی لەسەر خولیاکەی کردووە.

ئەم نمونەیە ڕاستەوخۆ دەمانگەیەنێت بە سێیەم بنەما، بنەمایەك بۆ ئەو کەسانەی ڕێگایەکی خێرا و ئاسانیان دەوێت تاوەکو فێری قسەکردنێکی کاریگە بن بۆ خەڵکی.

## سێیەم/ زۆر تامەزرۆ بە قسەکانت بۆ گوێگر باس بکەیت

لە هەر بارودۆخێکدا کە قسە دەکرێت، سێ لایەن هەن: قسەکەر، قسەکان، هەروەها گوێگر. دوو بنەماکەی یەکەم کە لەم بەشەدا ئاماژەیان پێ درا باسیان لە پەیوەندی قسەکەر و قسەکان دەکرد. تا ئێستا ئەوەی باسمان کردووە پێی ناوترێت ووتاردان یان حاڵەتی قسەکردن. تەنها کاتێك حاڵەتی قسەکردن یان ووتاردان ڕوودەدات کە قسەکەر قسەکانی بۆ کەسی بەرانبەر بکات. لەم کاتەدا دەکرێت کەسی

ووتاربێــژ بباشــی قســەکانی ئامادەکردبێــت: ڕەنگــە بابــەتێك بێــت قسەکەرەکە زۆر تامەزرۆی بێت، بەڵام بۆ ئەوەی تەواو سەرکەوتوو بێت، دەبێت لایەنێکی دیکە بێتە ناو قسەکانی. دەبێت وا لە گوێگر بکات بەشێوەیەك هەست بکەن کە ئەوەی قسەکەر دەیڵێت بۆ ئەمان زۆر گرنگە. نابێت تەنها تامەزرۆی قسەکانی بێت، بەڵکوو دەبێت زۆر بەلایەوە گرنگ بێت ئەو تامەزرۆییە بگوازێتەوە بۆ گوێگرەکانیشی. ووتاربێژی کاریگەر هەوڵ دەدات کارێك بکات گوێگرەکانی هەست بەو شتە بکەن کە خۆی هەستی پێ دەکات، لەگەڵ بۆچوونەکانیدا هاوڕابن، هەروەها تام و چێژ لەو کاتە ببینن کە لەگەڵیدان. ووتاربێژی کاریگەر و سەرکەوتوو کەسێکە گوێگر دەکات بە سەنتەر نەك خۆی. دەزانێت بۆ ئەو نییە بڕیار بدات ووتارەکەی شکستی هێناوە یان سەرکەوتوو بووە ـ ئەو بڕیارە لە مێشك و دڵی گوێگرەکانیدایە.

لە شاری نیو یۆر مەشقم بە ژمارەیەك کەس دەکرد کە لە بەشە بازارگەری بوون و لە کەمپینێکی ئابووریدا بەشدار بوون. یەکێك لەو کەسانەی مەشقم پێ دەکرد، نەیدەتوانی پەیامەکەی بە گوێگرەکانی بگەیەنێت. یەکەم هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ئەوەبوو مێشك و دڵی لەسەر بابەتەکەی گەرم بکەینەوە و تامەزرۆی بکەین. پێم گووت بڕۆ و خۆت بەتەنها بیر لە بابەتەکەت بکەرەوە تاوەکوو تەواو حەزی لێدەکەیت و تامەزرۆی باسکردنی دەبیت. پێم گووت لەبیرت نەچێت تۆمارەکانی نیویۆر ئەوە دەردخەن کە ٨٥٪ی خەڵکی کاتێك دەمرن، هیچ شتێك لەدوای خۆیان بەجێ ناهێڵن: ئەمەش واتای ئەوەیە تەنا ٣.٣٪ خەڵکی دوای مردنیان ١٠ هەزار دۆلار بەجێ دەهێڵن. بەردەوام لە مێشکی

خۆیدا وای دانابوو داوا لە خەڵك نەکات شتێك بکەن لە توانایاندا نەبێت. بە خۆی دەگووت: "من ئەو خەڵکە بۆ ئەوە ئامادە دەکەم کە لە تەمەنی پیریدا خۆراك و پۆشاکی باشیان هەبێت و ئاسودەبن، کە مردیشن ماڵ و منداڵیان لە ئاساییشدا بەجێ بهێڵن." وای دانابوو کە بچێتە دەرەوە و خزمەتێکی گەورەی کۆمەڵگا بکات.

بەجوانی بیری لەو داتا و زانیاریانە کردەوە، لە مێشکی خۆیدا تەواو خۆی ئامادەکرد، حەزی خۆی خستەگەڕ، پەرۆشیی خۆی تێکەڵ بە بابەتەکە کرد، تا وای لێهات هەست بکات ئەرکێکی گەورەی پێسپێردراوە. دواتر کە چووە دەرەوە قسە بکات، وشەکانی زۆر کاریگەر بوون، بۆنی بیرکردنەوە و قەناعەتەکانی خۆی لێ دەهات. توانی سوودەکانی دەستپێوەگرتن و ئابووریکردن بۆ گوێگرەکانی ڕوون بکاتەوە و قەناعەتیان پێ بکات، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو زۆر تامەزرۆ بوو هاوکاری خەڵکی بکات. ئەو کەسە تەنها قسەکەرێکی سادەی خاوەن داتا و زانیاری نەبوو: کەسێکی خاوەن ئامانج بوو.

پێشتر لە پیشەی وانەوتنەوە و فێرکارییەکانمدا زۆر پشتم بە یاسای ناو کتێبەکان دەبەست کە تایبەت بوون بە ووتاربێژییەوە. سەرەتای پیشەی ووتاربێژیم بوو، زۆر کارامە نەبووم. هەندێك لەو خووە خراپانەم لەبیرە کە لە شێوازی فێرکارییەکانمدا ڕەنگیان دابوویەوە.

هیچ کات یەکەم وانەم لەبیر ناچێت کە لەسەر قسەکردن و ووتاربێژی خوێندم. وا فێریان کردبووم دەستم بە لاتەنیشتەکانمدا شۆڕبێتەوە، ناو لەپی دەستیشم ڕووی لە دواوە بوو، پەنجەکانم تا نیوە کردبووەوە و پەنجەگەورەشم دابوو لە قاچم. وا فێرکرابووم دەستم بەرز بکەمەوە و

بەشێوەیەکی سادە مەچەکم بسوڕێنم، ئەنجا یەک بە یەک پەنجەکانم بکەمەوە. بەشێوەیەکی ڕۆبۆت ئاسا جوڵەکانم دەکرد. هیچ هەست و سۆزێك لە قسەکانمدا نەبوو.

ڕاهێنەرەکەشم هیچ هەوڵێکی نەدا ڕێکم بکاتەوە و بمهێنێتە کەسێکی ئاساییەوە، هیچ هەوڵی نەدا هاوکاریم بکات وەك کەسێکی ئاسایی قسە بکەم، وەك مرۆڤێکی زیندوو لەگەڵ گوێگراندا ڕەفتار بکەم و قسەکانم بگەیەنم.

ئەو شێوازە ڕۆبۆتییە پێچەوانەی ئەو یاسا بنەڕەتیانە بوون کە لەم بەشەدا بەدرێژی باسم لێوە کردوون. من هەمووکات لە ڕاهێنانەکانی تایبەت بە ووتاربێژیی کاریگەر، پشت بەو بنەمایانە دەبەستم. لەم کتێبەشدا چەندین جار دەیانبینیت و هەست بەو ڕاستییە دەکەیت. لە سێ بەشی دواتردا، بەوردی و بەدوورودرێژی باسی هەر یەکێك لەو سێ یاسایە دەکەین.

**پوختەی بەندی یەکەم**

بنەماکانی قسەکردن بەشێوەیکی کاریگەر

**بەشی یەکەم: فێربوونی توانا سەرەتاییەکان**

یەکەم/ سوود لە ئەزموونی کەسانی دیکە وەربگرە

دووەم/ ئامانجەکەت لەپێش خۆتەوە دابنێ

سێیەم/پێشوەخت مێشکت بۆ سەرکەوتن ئامادە بکە

چوارەم/ هەموو درفەتەکان بقۆزەوە

**بەشی دووەم: پەرە بە ئاستی بڕوابەخۆبوونت بدە**

یەکەم/ ئەو ڕاستیانە بزانە کە تایبەتن بە ترسی ووتاربێژی

دووەم/ بەشێوەیەکی دروست خۆت ئامادە بکە

هەرگیز بابەتەکان وشە بە وشە لەبەر مەکە

پێشوەخت بیرۆکەکانت کۆکەرەوە و ڕێکیان بخە

لەگەڵ هاوڕێکانتدا ڕاهێنان لەسەر قسەکانت بکە

سێیەم/ پێشوەخت مێشکت بۆ سەرکەوتن ئامادە بکە

خۆت نوقمی بابەتەکەت بکە

بیر و هۆشت لای ئەو هەستە نەرێنیانە لاببە کە دەکرێت نیگەرانت بکەن

هانی خۆت بدە

چوارەم/ بە بڕواوە ڕەفتار بکە

**بەشی سێیەم: ڕێگایەکی خێرا و ئاسان بۆ گفتوگۆیەکی کاریگەر**

یەکەم/ باسی شتێك بکە کە ئەزموونی خۆتە یان لەبارەیەوە خوێندووتە

پێمان بڵێ ژیان چی فێری تۆ کردووە

لەناو ئەزموونەکانتدا بەدواى بابەتدا بگەڕێ

دووەم/ دڵنیا بە لەوەی زۆر حەزت لە بابەتەکەی خۆتە

سێیەم/ زۆر تامەزرۆ بە قسەکانت بۆ گوێگر باس بکەیت

# بەنـدی دووەم



## قسە، قسەکەر، و گوێگر

لەم بەندەدا باس لە سێ گۆشەکەی قسە دەکەین ـ سێ لایەنی سەرەکی لە هەموو ووتارێکدا.

یەکەم، قسە خۆی. فێری ناوەڕۆکی قسەکان دەبین، باس لەوە دەکەیت دەبێت چۆن ئەو قسانە لە ئەزموونەوە سەرچاوە بگرن.

دووەم، قسەکەر. لێرەدا باسی تایبەتمەندییەکانی مێشك، جەستە، و دەنگ دەکەین کە پێویستە وزە بە قسەکان ببەخشن.

سێیەم، گوێگر. ئەمەش ئەو نیشانەیە کە دەیکەین بە ئامانج، و خاڵی یەکلاکەرەوەیە لە شکست یان سەرکەوتنی قسەکەردا.

## ((بەشی چوارەم))

# کارامەبوون و بەدەستهێنانی توانای قسەکردن

---

چەند ساڵێك لەمەو پێش، کەسێك دکتۆرای لە فەلسەفەدا هەبوو، کەسێکی زۆر بەهێز و هەڵکەوتە بوو، هەموو تەمەنی گەنجێتیی لە سوپای بەریتانیادا بەسەر بردبوو، لە یەکێك لە خولەکانم لە نیویۆرك ناوی نووسی و بەشداربوو. ئەو پیاوە بەو بڕاونامەیەوە پرۆفیسۆری زانکۆ بوو. لەولاشەوە کەسێکی دیکەی لێبوو کارمەندی گواستنەوەی شمەك و کاڵا بوو. ئەوەی سەیر بوو ئەوەبوو کە بەلای بەشدابووانی خولەکەوە قسەی کارمەندەکە زۆر لە قسەی پرۆفیسۆر باشتر بوون. بۆچی؟ کابرای پرۆفیسۆر ومانێکی سەرنجڕاکێشی بەکارهێنا. کەسێکی ڕووخۆش و ڕەوشت بەرز بوو، خوێنەوار و ڕۆشنبیر بوو. قسەکانی هەمووی لۆژیکی و ڕوون بوون، بەڵام لە یەك شتی بنەڕەتیدا کەموکورتی هەبوو ـ ڕوونی. قسەکانی ناڕوون و گشتی بوون. هیچ کاتێك کە خاڵێکی باس دەکرد، ڕوونکردنەوەی نەدەدا و ئەزموونی خۆی لەو بارەیەوە نەدەخستەڕوو. قسەکانی تەنها زنجیرەیەك بابەتی واتایی (مەعنەوی) بوو کە بە دەزوویەکی لاوازی لۆژیك پێکەوە بەسترابوون.

لەلایەکی دیکەوە، زمانی کابرا زۆر ڕوون، سەردەمیانە، و سەرنجڕاکێش بوو. باسی لە ژیانی ڕۆژانە دەکرد. خاڵێکی بۆ باس دەکردین، دواتر بە نموونەیەك کە لە پیشەکەیدا بەسەری هاتبوو،

پاڵپشتی قەسکەی دەکرد. باسی ئەو کەسانەی دەکرد کە ڕەفتار و مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، هەروەها باسی سەرێشە و ناڕەحەتییەکانی پیشەکەی و ژیانی ڕۆژانەی دەکرد. سازگاری و بەهێزی دەستەواژەکانی وای کردبوو قسەکانی زۆر سوودبەخش و سەرنجڕاکێش بن.

ئەو نموونەیەم لەبەر ئەوە باس نەکرد کە نموونەی دوو کەسی جیاواز بوو، پرۆفیسۆرێك و پیاوێکی ئاسایی، بەڵکوو لەبەر ئەوەی لەو نموونەیەوە تێدەگەین کاتێك قسەیەکی پڕ لە زانیاری دەکەین و بەوردی ڕوونکردنەوە دەدەین، بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر سەرنجی بەرانبەر ڕادەکێشین.

چوار ڕێکا هەیە کە گرەنتی ئەوە بە قسەکانت دەبەخشن سەرنجی گوێگر ڕابکێشن. ئەگەر لەکاتی خۆئامادەکردندا شوێن ئەو هەنگاوانە بکەویت، گوێگرەکانت تامەزرۆ دەکەیت و سەرنجیان بۆ خۆت ڕادەکێشیت.

**یەکەم/بابەتەکەت سنوردار بکە**

هەر کە ناونیشانەکەت دیاری کرد، یەکەم هەنگاو ئەوەیە ئەو لایەنە دیاری بکەیت کە دەتەوێت باسی بکەیت، وە پێویستە پابەند بیت بەو بەشەی دیاریت کردووە و لێی لانەدەیت. ئەو هەڵەیە نەکەیت بابەتەکەت زۆر گشتی و فراوان بێت. کەسێك هەوڵی دا لە دوو خولەکدا قسە لەسەر بابەتی، "ئەسینا لە ٥٠٠ی پێش زایین تاوەکوو جەنگی کۆریا" قسە بکات. چەند بێ کەڵك بوو! هەر نەیتوانی باسی بناغەی وڵاتەکە بکات کاتەکەی تەواو بوو، ئەمەش قوربانییەکی دیکەیە لەو کەسانەی کە هەوڵیان داوە

لە یەك ووتاردا باسێکی فراوان تاوتووێ بکەیت. دەزانم ئەمە نموونەیەکی زۆر پەڕگر و شازە، بەڵام هەزاران نموونەی دیکەم بیستووە کە بە هەمان هۆکار نەیانتوانیووە سەرنجی گوێگر بۆ خۆیان ڕاکێشن ـ لە یەك کاتدا بابەتێکی زۆریان باس کردووە. بۆچی ناتوانیت بابەتێکی فراوان هەڵبژێریت؟ لەبەر ئەوەی مێشك ناتوانێت پابەندبێت بە زنجیرە زانیارییەکی دووبارەی بێزارکەرەوە. ئەگەر قسەکانت وەك ساڵنامەیەك وابێت کە هەموو ساڵێك هەمان بابەت باس بکات، دڵنیابە ناتوانیت بۆ ماوەیەکی زۆر سەرنجی گوێگرەکانت ڕاکێشیت. باس لە بابەتێکی سادە بکە، وەك گەشتێك بۆ شوێنێکی دیاریکراو. بەڵام دەبێت ئەوە بزانیت کاتێك کەسێك باسی گەشتێکی دەکات بۆ فڵانە شوێن، ئەگەر زۆر بەپەرۆشەوە تەواوی گەشتەکەی باس بکات، باس لە یەك بە یەکی دیمەن و شوێنەکان دەکات، گوێگر لەم بابەت دەباتە ئەو بابەت، لەم شوێن بۆ ئەو شوێن. لەکۆتاییشدا هەموو ئەوەی لە مێشکی گوێگردا دەمێنێتەوە تەنها دیمەنێکی تەمومژاوی بابەتەکەیە، وەك چیایەکی ناڕوون وایە هەموو شتەکان بیردەچنەوە. بەڵام ئەگەر قسەکەر سنور بۆ بابەتەکە دابنێت و تەنها باس لە یەك لایەنی گەشتەکەی بکات، ئەوکات بابەتێکر لەیادنەکراو دەبێت. بە نموونە، دەتوانیت باسی دیمەنی سروشتی یان ئاو و کانیاوەکان بکەیت. ئەوکات وەك ئەوە وایە بە وێنەوە بابەتەکەت ڕوونکردبێتەوە و هەموو دیمەن و جوانییەکان بە گوێگر دەگەیەنیت.

ئەمە بۆ هەموو بابەتێك ڕاستە، ئەگەر فرۆشیاری بێت، نانەوایی بێت، خۆدزینەوە بێت لەباج، یان موشەکی بالیسی بێت. هەرچییەك بێت

دەبێت پێش ئەوەی دەسپێبکەیت شتەکان سنوردار بکەیت، دەبێت بابەتەکەت بەرتەسك بکەیتەوە بۆ شتێك کە لەگەڵ کاتەکەتدا بگونجێت. لە قسەی کورتدا، لە ماوەی پێنج خولەکدا تەنها یەك دوو خاڵ باس بکە. لە ووتاری دوورودرێژدا، چوار تا پێنج خاڵی سەرەکی باس بکە. کەم ووتاربێژ هەیە توانیبێتی لەو ڕێژەیە زیاتر باس بکات و سەرکەوتوو بێت.

**دووەم/ گەشە بە توانا شاراوەکانت بدە**

زۆر ئاسانە ووتارێك پێشکەش بکەیت و سەرپێی بابەتەکات هەڵکوڕوزێنیت وەك لەوەی بچیتە قوڵایی بابەتەکە و زانیارییەکان شیکار بکەیت، بەڵام دەبێت ئەوە بزانیت بەو ڕێگا ئاسانە هیچ کاریگەری لەسەر گوێگرەکانت بەجێ ناهێڵیت. دوای ئەوەی ناونیشان و بابەتەکەت سنوردار کرد، هەنگاوی دواتر ئەوەیە ئەو پرسیارانە لە خۆت بکەیت کە تێگەشتنت لەو بابەتە زیاتر دەکەن و بۆ قسەکردن ئامادەت دەکەن: من بۆچی بڕوام بەم بابەتە هەیە؟ ئایا ئەم خاڵە لەگەڵ نموونەیەکی ئەزموونی ژیانی خۆمدا یەکدەگرێتەوە؟ ئایا بەدیاریکراوی دەمەوێت چی شتێك بسەلمێنم؟ بەدیاریکراوی چۆن ئەو شتە ڕوویدا؟

پرسیاری لەو شێوەیە پێویستی بە وەڵامە، بەجۆرێك کە گەشە توانا شاراوەکانت دەدات، توانایەك کە وا لە بەرانبەرەکەت دەکات دانیشن و گوێت بۆ بگرن. دەگووترێت لوسەر بێربانك، پسپۆڕی گوڵ و ڕوەك، ملیۆنێك ڕووەکی چاندبوو بۆ ئەوەی یەك یان دوو لە باشترینەکانیان هەڵبژێرێت. لە قسەکردن و ووتاردانیشدا هەمان شت ڕاستە. سەدان

بۆچوون و بیرکردنەوەی جۆربەجۆر بەدەوری بابەتەکەتدا کۆ بکەرەوە، دواتر نەوەد و نۆیان لابە.

جۆن گوزەر باسی ئەوەمان بۆ دەکات چۆن بۆ ووتارێك یان بۆ نووسینی کتێبێك خۆی ئامادە دەکرد و دەڵێت: "هەمیشە دە هێندەی ئەو زانیارییە کۆدەکەمەوە کە بەکاری دەهێنم."

بەتایبەت جارێکیان ڕەفتارەکانی تەواوی قسەکانی سەلماند. لە ساڵی ١٩٥٦، کاری لەسەر چەند بابەتێك دەکرد کە تایەبت بوو بە نەخۆشخانە دەروونییەکانەوە. سەردانی خانەی چاودێری[٢] کرد، قسەی لەگەڵ سەرپەرشتیارەکانیدا کرد، قسەی لەگەڵ چاودێر و خوودی نەخۆشەکانیشدا کرد. هاوڕێیەکم لەگەڵیدا بوو، لە توێژینەوەکەیدا هاوکاری دەکرد، دەیگووت ڕۆژانە چەندین کیلۆمەتر بەپێ ڕۆشتوون، لەم باڵەخانە بۆ ئەو باڵە خانە، لەم قاوش بۆ ئەو قاوش. جۆن گوزەر چەندین تیانووس (دەفتەر)ی پڕکردەوە. لە ژوورەکەشیدا هەموو ڕاپۆرتی نەخۆشخانەکان و ئامارەکانی لیژنەی پزیشکی کۆکردبووەوە کە ٤٠٠ پەڕە بوون.

هاوڕێکەم وتی، "لە کۆتاییدا چوار بابەتی کورتی نووسی، ئەوەندە سادە و پوخت بوون بتوانیت بەباشی قسەیان لەسەر بکەیت. ڕەنگە ئەو پەڕانەی بابەتەکانی لەسەر نووسیبوو چەند گرامێك بووبێت. بەڵێ، چەند تیانووسێکی پڕکردەوە و هەموو شتێکی بەکارهێنا بۆ ئەوەی بابەتێکی

---

[٢] جێگەیەکی تایبەتە بەو کەسانەی نەخۆشی دەروونییان هەیە یان نارێکی هەیە لە مێشکیاندا - وەرگێر

چەند گرامی بنووسێت، بێگوومان ئەو بابەتەی بەو شێوەیە ئامادەکرابێت کێشی چەندین کیلۆی هەیە."

جۆن گوزەر باش لەوە تێگەشتبوو کە ئەو ئیشەی ئەم دەیکات بابەتێکی زۆر گرنگە و دەرەنجامەکەی زۆر بەسوودە. تێگەشتبوو ناکرێت هیچ بابەتێك بەبێ زانیاری تێپەڕێنێت. کەسێکی بەئەزموون و شارەزا بوو لەو بوارەدا، مێشکی دابوو بە بابەتەکەی و خۆی بۆ تەرخان کردبوو، هەموو شتەکانی لە بێژنگ دا و زێڕێکی پوختی دەرهێنا.

پزیشکێکی هاوڕێم وتی: "دەتوانم لە ١٠ خوولەکدا فێری ئەوەت بکەم چۆن ڕیخۆڵەکوێرە ببڕیت، بەڵام چوار ساڵم دەوێت فێرت بکەم کاتێك هەڵەیەك ڕوودەدات چی بکەیت." ئەمەش لەگەڵ ووتاربێژیدا یەکدەگرێتەوە: هەمیشە خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی لە کاتە کتوپڕەکاندا ئامادە بیت، بە نموونە پێش تۆ کەسێك قسەی کردووە و داوات لێ دەکەن پاڵپشتی قسەی ئەو کەسە بکەیت و بسەلمێنی ڕاستن، یان ڕەنگە لەناو گوێگرەگاندا تووشی پرسیارێك بیت کە بەمەبەستێکی دیاریکراوی لەپشتە.

تۆش دەتوانیت پەرە بە توواناکانت بدەیت، ئەمیش بەوەی چی زووە ناونیشانەکت دەستنیشان بکەیت. کاتێك بڕیار وایە سیمینارێك پێشکەش بکەیت یان لە کوڕێکدا قسە بکەیت، خاوەخاو مەکە لە هەڵبژاردنی ناونیشاندا، دوای مەخە تا یەك دوو ڕۆژ پێش پێشکەشکردنی بابەتەکە. ئەگەر زوو ناونیشان و بابەت هەڵبژێریت، ماوەیەکی دوورودرێژ مێشکت بەشێوەیەکی خۆکارانە بیر لەو بابەتە دەکاتەوە و سوودێکی زۆرت پێدەگەیەنێت. دەتوانیت لە کاتە بەتاڵەکاندا بەدوای ئەو بابەتەدا

بگەڕێیت و زانیاری کۆبکەیتەوە، دەتوانیت لەو ماوەیەدا ئەو بۆچوون و بیرکردنەوانە پوختە بکەیت کە دەتەوێت بە گوێگرەکانتی بگەیەنیت. لەکاتی شۆفێریکردن وچاوەڕوانی پاسدا یان لە کاتەکانی دیکەدا کاتێکی زۆر بە خەیاڵکردنەوە بەسەر دەبەیت، ئەوە سروشتی هەموومانە، بەڵام گەر بەزوویی ببەتەکەت دەستنیشان بکەیت دەتوانیت ئەو کاتانە بە بیرکردنەوە لەو بابەتە بەسەر ببەیت. هەمیشە زیاتر لەو کاتانەدا بیرۆکە و دیدگای جۆربەجۆرت بۆ دێت، چونکە پێشوەخت بابەتەکەت دیاری کردووە و مێشکی نیوەهۆشیارت کاری لەسەر کردووە.

نۆرمان تۆماس، ووتاربێژێکی نموونەییە و ناوبانگ و ڕێزێکی جەماوەری تایبەتی هەیە، دەڵێت، "ئەگەر کەسێك بیەوێت قسەکانی گرنگ بێت، دەبێت لەگەڵ پەیام و ناوەڕۆکی ئەو بابەتەدا بژی، بەردەوام لە مێشکی خۆیدا بیری لێ بکاتەوە. ئەوکات بۆ ئەوەی بابەتەکەی بگەیەنێت ئەوەندە شێواز و ڕێگای جیاواز دێت بە مێشکیدا، سەرسام دەبێت. زۆربەی کات ووتاری ئاست نزم دەرەنجامی بیرکردنەوەیەکی نەگونجاوە لە بابەتێکی ئاست نزم، و دەرەنجامی نەشارەزاییە لەگەڵ بابەتەکەدا."

کاتێك بەو شێوەیە بیر لە بابەتەکەت دەکەیتەوە و تێکەڵی دەبیت، زۆر حەزدەکەیت وشە بە وشە قسەکانت بنووسیت. لەبەر ئەوە هەوڵ بدە هەرگیز شتی وا نەکەیت، چونکە هەر کە نووسیتەوە و شێوەکەی کەوتە بەرچاوت، ڕەنگە خووی پێوە بکریت و چیتر بیر لە ناوەڕۆکەکەی نەکەیتەوە. سەرباری ئەوەش، لەبەرکردنی نووسین مەترسی خۆی هەیە.

چارلس فرانکلین، یەکێك لە ووتاربێژە بەناوبانگ و خۆشەویستەکانی ئەمریکا، پرسیاری لێکرا کە ئایا تا ئێستا ڕوویداوە بەشێك یان هەموو

قسەکانی نووسیبێتەوە، لە وەڵامدا وتی: "من بڕوام وایە ئەو قسانەی لە ووتارەکانمدا دەیانکەم زۆر لەوە گرنگترن لەسەر کاغەز بیان نووسمەوە. پێم خۆشە بە هەموو بوونمەوە قسەکان لەمێشك و هەست و سۆزی گوێگرەکانمدا بنووسمەوە. پارچە کاغەزێك ناتوانێت لە نێوان من و ئەو کەسانەدا بووەستێت کە بەنیازم سەرسامیان بکەم."

## سێیەم/ قسەکانت پڕ بکە لە ڕوونکردنەوە و نموونە

نۆرمان ڤینسنت، کە بە ملیۆنان کەس لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانەوە گوێبیستی ووتارەکانی دەبوون، دەڵێت، باشترین شێواز بۆ پاڵپشتی و سەلماندنی قسەکانم نموونە و وێنەیە. جارێکیان وتی: "نموونەی ڕاستی (واقیعی) باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی بیرۆکە و پەیامەکەت ڕوون، سەرنجڕاکێش، و قیلکەر بێت. بەگشتی من بۆ ئەوەی خاڵە سەرەکییەکانم ڕوون بکەمەوە چەند نموونەیەك دەهێنمەوە."

من وەك خۆم زۆر لەگەڵ ئەو ڕایەدام. گەر خەڵکی کتێبەکانم بخوێننەوە، زوو لەوە تێدەگەن کە بۆ ڕوونکردنەوەی پەیامەکەم چیرۆك و بەسەرهاتی جۆربەجۆرم بەکارهێناوە. ئەو یاسانەی لە کتێبی "هونەری هاوڕێگرتن" باسم کردوون، هەموویان لە یەك لاپەڕە و نیودا جێگەیان دەبێتەوە. دووسەد و سی لاپەڕەکەی دیکەی کتێبەکە پڕە لە چیرۆك و ڕوونکردنەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە خوێنەر لەو نموونانەوە تێبگات کەسانی دیکە چۆن ئەو یاسا و بنەمایانەیان بەشێوەیەکی کاریگەر بەکارهێناوە.

ئایا چۆن ئێمەش بتوانین ئەو تەکنیکە (چیرۆك و بابەتی دیکە) بەکاربهێنین؟ پێنج ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەیت: مرۆڤێك

بکە بە نموونە لە چیرۆکەکەتدا، تایبەتی بکە بە کەسێکەوە، قسەکانت پڕ بکە لە زانیاری دەقیق، قسەکانت بکە بە دراما، و ئەوەی باسی دەکەیت بیهێنە پێش چاوی گوێگر.

ئێستاش با یەك بە یەك باس لەو ڕێگایانە بکەین:

## مرۆڤ بکە بە نموونە لە چیرۆکەکەتدا

جارێکیان لە پاریس پرسیارم لە هەندێك بازرگان کرد قسە لەسەر بابەتی "چۆن سەرکەوتوو بین" بکەن. زۆربەیان ژمارەیەك تایبەتمەندی و بنەمای واتایی (مەعنەویی)یان ڕیزکرد و باسی گرنگیی هەوڵدان و بەردەوامی و هەبوونی ئامانجیان کرد.

ئەوەبوو منیش خولەکەم ڕاگرت و ئەمەم گووت: "ئێمە نامانەوێت وانەمان پێ بڵێن، کەس حەزی لەوە نییە. لەبیرتان نەچێت دەبێت سەرنجڕاکێش بن ئەگەر نا گرنگی بەو شتانە نادەین کە دەیلێن. هەروەها ئەوەتان لەبیر بێت یەکێك لە سەرنجڕاکێشترین شتەکان لە دونیادا بریتییە لە باسکردنی خەڵکی - بەشێوەیەکی ئەرێنی نەوەك زەمکردن. لەبەر ئەوە چیرۆکی دوو کەس بگێڕنەوە کە دەیانناسن، پێمان بڵێن بۆچی یەکێکیان سەرکەوتوو بوو، وە بۆچی ئەوی دیکە شکستی هێناوە. ئێمەش بەخۆشحاڵییەوە گوێدەگرین و سوودمەند دەبین."

لەو خولەدا بەشداربوویەکی لێبوو کە زۆر بەلایەوە قورس بوو بتوانێت بەبایەخەوە قسە بکات و سەرنجی گوێگرەکانی ڕاکێشێت، بەڵام ئەو شەوە ئەو بنەمایە (بەنموونە هێنانەوەی کەسێك) کاری لێکرد، ئەوەبوو باسی دوو هاوڕێی زانکۆی کرد. یەکێکیان ئەوەندە خۆپارێز بوو کە

چووبوو لە چەند دووکانێك کراسی کڕیبوو، ئەنجا زانیاری لەسەر هەموویان کۆکردبووەوە بۆ ئەوەی بزانێت کامیان لە هەموویان باشترە و کامیان لە هەموویان زیاتر بەرگە دەگرێت و درەنگ دەدڕێت. هەموو کاتێك هەر مێشکی لای پارە و نرخ بوو: کەچی کاتێکیش زانکۆی تەواو کرد ـ بەشی ئەندازیاری ـ ئەوەندە لە خۆی ڕازیبوو، کە وەك هەموو هاوڕێکانی دیکەی، ئامادە نەبوو ئیشێکی ئاسایی بکات. تەنانەت دوای سێ ساڵ کە ئاهەنگی دەرچوون (تەخەڕوج) سازکرا و هەموومان کۆبووینەوە، هەر خەریکی هەواڵپرسینی نرخی کراس و دۆزینەوەی پۆشاکی هەرزان بوو، هەر چاوەڕوانی ئیشێکی باش بوو، هەر دەستیشی نەکەوت. لەو کاتەوە ئەوە چارەکە سەدەیەك تێپەڕی، ئەو پیاوە هەر نائاسودە و بێزار بوو لە ژیان، تا ئێستاش لە پلەیەکی نزمدایە.

دواتر ئەو کەسەی قسەی بۆ دەکردین نموونەی هاوپۆلێکی هێنایەوە کە تەواو پێچەوانەی ئەوەی یەکەم بوو، کەسێك بوو بەسەر هەموو بەربەستەکاندا سەرکەوتبوو. ئەو پیاوە کەسێکی ڕووخۆش بوو، هەموو کەسێك خۆشی دەویست. هەرچەندە ئاواتی ئەوەبوو شتی گەورە بکات، بەڵام سەرەتا بە وێنەکێشان دەستی پێ کرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کاتێك بۆ دەرفەت دەگەڕا. ئەوەبوو لە نیویۆرك خەریکی ئامادەکاری بوون بۆ پێشانگایەکی نێودەوڵەتی[3]. ئەمیش دەیزانی لەوێ بەهرە و توانای ئەندازیاریی پێویستە، بۆیە لە فیلەدێلفیا وازی لە کارەکەی هێنا و

---

[3] ئەم پێشانگایە پێکهاتبوو لە ١٤٠ چادرگە، ١١٠ چێشتخانە بۆ ٨٠ نەتەوەی جۆربەجۆر، ٢٤ ویلایەتی ئەمریکی و ٤٥ دامەزراوە و کۆمپانیا، هەموو ئەمانە بۆ نمایشی بەرهەم و بەستنی ڕێکەوتنی بازرگانی بوو لەگەڵ یەکتردا ـ وەرگێڕ.

ڕۆشت بۆ نیویۆرك. لەوێ بەهاوبەشی لەگەڵ کۆمپانیایەکدا دەستی کرد بە کاری بەڵێندەری. کارێکی باشیان بۆ کۆمپانیایەکی پەیوەندیکردن ئەنجام دا، ئەوەبوو مووچەیەکی باشی دەستکەوت. من تەنها کەمێکی ئەو وتانەم تۆمار کردووە کە ئەو پیاوە باسی لێوە کرد. قسەکانی ڕازاندەوە و بەباسکردنی بابەتی کەسێکی دیکە، توانی قسەکانی بەتام و چێژ بکات. بەردەوام هەر قسەی دەکرد ـ ئەمە ئەو پیاوە بوو کە بەشی سێ خولەك قسەی پێ نەبوو ـ کاتێکیش وەستا و تەواو بوو، پێی سەیر بوو کە ١٠ خولەکە لەو شوێنەدا قسەی کردبوو. قسەکانی ئەوەندە سەرنجڕاکێش بوون کە هەموومان بەلامانەوە کورت بوو. بەڵێ، ئەوە یەکەم سەرکەوتنی ڕاستەقسنەی بوو.

بەشێوەیەکی گشتی هەموو کەسێك دەتوانێت سوود لەو ڕووداوە وەربگرێت. ئەگەر قسەکانت دەوڵەمەندبێت بە چیرۆکی سەرنجڕاکێشی کەسانی دیکە، ئەوکات دەبێت بە ووتارێکی زۆر سەرنجڕاکێش. باش وایە هەمووکات قسەکەر هەوڵ بدات چەند خاڵێکی کەم باس بکات ئەنجا بە ڕووداوی ڕاستەقینە ڕوونیان بکاتەوە. ئەم شێوازی قسەکردنە مەگەر بەدەگمەن ئەگەر نا هەموو کاتێك سەرنجی گوێگر بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. بەدڵنیایشەوە دەوڵەمەندترین سەرچاوە لەو جۆر بابەتە مرۆییانەدا بریتییە لە ئەزموونی خۆت. دوودڵ مەبە لە باسکردنی ئەزموونی خۆت، وا بیر مەکەرەوە کە نابێت باسی خۆت بکەیت. تەنها کاتێك گوێگر ڕقی لەوەیە باسی خۆت بکەیت کە بەشێوەیەکی ناشرین و لەخۆباییبوونەوە ئەو کارە بکەیت. ئەگەر نا گوێگر زۆر ئارەزووی لەو

چیرۆکە کەسیانەیە کە قسەکەر باسیان دەکات. باسکردنی چیرۆك دڵنیاترین ڕێگایە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بەرانبەر: بۆیە فەرامۆشیان مەکە.

## بە بەکارهێنانی ناو، قسەکانت تایبەت بکە بە کەسێکەوە

کاتێك چیرۆکێك دەگێڕیتەوە و چەند کەسێکی دیکەی تێدا بووە، هەتا دەتوانیت ناویان بهێنە، یان ئەگەر دەتەوێت نەناسرێن و ناسنامەیان ئاشکرا نەبێت، ناوی خوازراو بەکار بهێنە. ناوی هاوشێوەی "کاك ئەحمەد" یان "خاتوو سارا" زۆر لەوە باشترن بڵێی "ئەو پیاوە" یان "ئەو ژنە." ناوەکان کەسەکان زیاتر دەناسێنن و تایبەتیان دەکەن. هەر وەك ڕودۆڵف فلێش ئامارەی پێدەدات و دەڵێت، "هیچ شتێك هێندەی ناوهێنانی کەسەکان ڕاستی بە چیرۆك نابەخشێت: هیچ شتێك هێندەی ئەوە لە ناڕاست ناچێت کاتێك چیرۆکێك دەگێڕیتەوە کەسەکان نەناسراو و بێ ناوبن. بێنە پێش چاوت چیرۆکێك پاڵەوانەکەی ناوی نەبێت ئەبێت چۆنبێت."

## قسەکانت پڕ بکە لە زانیاری دەقیق

ڕەنگە لەم خاڵەدا بڵێیت، "ئەمە شتێکی باشە، بەڵام چۆن دڵنیا ببمەوە لەوەی لە قسەکانمدا وردەکاری تەواوم کردووە و زانیاری دەقیقم بەکارهێناوە؟" تاقیکردنەوەیەك هەیە. ئەو پێنج پرسیارە بەکار بهێنە کە هەموو چیرۆك نووسێك لە نووسینی چیرۆکدا بەکاریان دەهێنێت: وەڵامی پرسیارەکانی کەی؟ لەکوێ؟ کێ؟ چی؟ و بۆچی؟ بدەرەوە. ئەگەر ئەو شێوازە بەکار بهێنیت، نموونەکانت سەرنجڕاکێش و زیندوو دەبن. با بە

ئـەزموونێکی خـۆم ئـەم بابەتـەت بـۆ ڕوون بکەمـەوە، بابەتێکـە کـە لـە ڕۆژنامەیەکیشدا بڵاوکرایەوە:

"دوای تەواوکردنی زانکۆ، ماوەی دوو ساڵ لە داکۆتای باشوور وەك فرۆشیار کارم بۆ کۆمپانیایەکی لەقوتونانی گۆشت دەکرد. بە شەمەندەفەرە بارهەڵگرەکانی ئەو ناوچەیە دەگەڕام و هاتووچۆم دەکرد. ڕۆژی وا هەبوو لە ڕێدفیلد نزیکی دوو کاتژمێر چاوەڕوانی شەمەندەفەرم دەکرد. لەبەر ئەوەی ڕێدفێلد شوێنی خۆم نەبوو و شارەزا نەبووم، نەمدەتوانی ئەو دوو کاتژمێرە بەهەند وەرگرم و لەو شوێنەدا بەباشی شت بفرۆشم. دوای کەمتر لە ساڵێك، چووم بۆ نیویۆرك بۆ ئەوەی لە بەشی شانۆ بخوێنم، بۆیە بڕیارم دا کاتە بەتاڵەکانم تایبەت بکەم بە مەشقکردن لەسەر چۆنییەتی قسەکردن. جارێکیان بە شەقامێکدا دەگەڕام، دەستم کرد بە پڕۆڤە و ڕاهێنان لەسەر دیمەنێکی *ماکبێس*. دەستم دەرهێنا و دەمکێشا بە خۆمدا، دەستم کرد بە گریانێکی توند: 'ئایا ئەوە خەنجەرە لەبەردەممدایە و دەسکەکەیشی ڕووی لە دەستمە؟ وەرە، ڕێگەم بدە توند بتگرم: تۆ لەلام نیت، کەچی هەر دەتبینم.'

هێشتا لە قووڵایی ئەو دیمەنەدا بووم، پۆلیس بەپەلە هات و لێیان پرسیم بۆچی خانمانی ئەو شوێنەم ترساندووە. ڕاستییەکەی ئەگەر بە دزینی شەمەندەفەرێکیش تۆمەتباریان بکردبام، پێم سەیر نەدەبوو. پۆلیسەکان پێیان وتم ژنێك لە پشتی پەردەی چێشتخانەکەیەوە لە دووری سەد مەترەوە تەماشای کردبوو، هیچ کات شتی وای نەبینیبوو. لەبەر ئەوە پەیوەندیی کرد بە پۆلیسەوە، ئەوەی سەیر بوو ئەوەبوو کاتێك پۆلیسەکان لێم نزیك بوونەوە، دەمقیژاند و باسی خەنجەرم دەکرد.

"پێم گووتن هیچ نییە تەنها ڕاهێنانم لەسەر بابەتێکی شەیکسپیر دەکرد، دەبێت بەم شێوەیە کڕیاریان بۆ زیاد بکەم بۆ ئەوەی کۆمپانیاکەم دەرم."

سەرنج بدە چۆن ئەو چیرۆکە کورتە وەڵامی هەر پێنج پرسیارەکەی سەرەوەی دایەوە. هیچ باس نەکەیت باشترە لەوەی زانیاری زۆر باس بکەیت. هەمووومان بە خوێندنەوە و باسکردنی زانیاری پڕوپوچ و ناپەیوەست بێزار دەبین. سەرنج بدە چۆن لەو ڕووداوەدا وەڵامێکی کورت و پوختی هەر پێنج پرسیارەکەی تێدابوو. ئەگەر درێژە بە قسەکانت بدەیت و پڕی بکەیت لە وردەکاری، خەتێك بەسەر ناوەکەتدا دەهێنن و گوێت لێ ناگرن. هیچ شتێکیش لەوە ناخۆشتر نییە گوێت بۆ نەگیرێت.

## قسەکانت بکە بە دراما ـ ئاخاوتنی کەسانی دیکە بەکار بهێنە

وای دابنێ دەتەوێت باسی ئەوە بکەیت کە چۆن توانیوتە کڕیارێکی تووڕە هێور بکەیتەوە. دەکرێت بەم شێوەیە دەست پێ بکەیت:

"ڕۆژی دواتر، پیاوێك هاتە ئۆفیسەکەم. زۆر تووڕە بوو، ئەمەش اەبەر ئەوە بوو ئەو ئامێرەی ئێمە بۆمان ناردبوو بەباشی ئیشی نەکردبوو. پێم گووت هەرچیمان لەدەست بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە ئەنجامی دەدەین. دوای کەمێك کابرا کە بینی ئامادەین هاوکاری بکەین ئاسوودە بوو و هێور بوویەوە." ئەم چیرۆکە یەك لایەنی باشەی هەیە ـ زۆر تایبەت بوو ـ بەڵام کەموکورتی هەبوو لە ناوهێناندا، لەڕووی وردەکارییەوە بابەتەکە کەموکورتی تێدا بوو، لەسەرو هەمووشییەوە شێوازی

ئاخاوتنەکە. با ئێستا بەشێوەیەکی دیکە بیگێڕینەوە و ئەو کەموکورتیانەی پڕ بکەینەوە:

سێشەممەی ڕابردوو، دەرگای ژوورەکەم شەقەی هات و منیش سەرم بەرز کردەوە ئەو دیمەنە تووڕەم بینی کە بە ڕووخساری چارلس بلێکزم'ەوە بوو، کە یەکێك بوو لە کڕیارەکانم. فریای ئەوە نەکەوتم پێی بڵێم فەرموو دابنیشە. وتی، 'تەواو گەیشتە گیانم، هەر ئێستا ئۆتۆمبیلێك بنێرە و ئەو جلشۆرە ببە دەرەوە لە ماڵەکەم.'

"منیش پرسیم چی بووە؟. زۆر بەپەرۆش بوو قسەکانی بکات. هاواری کرد و وتی، 'ئیش ناکان، جلەکان گیردەخۆن تیایدا، خێزانەکەم بێزار و ماندوو بوو بەدەستییەوە.' منیش داوام لێکرد دانیشێت و بەوردی بۆم باس بکات چی بووە. 'کاتی ئەوەم نییە دانیشم. درەنگە بۆ کارەکەم. خۆزگە هەر نەهاتمایە بۆ ئێرە و ئەو جلشۆرەم نەکڕیبا. بڕوا بکە هەرگیز هەڵەی وا ناکەمەوە.' دەستی کێشا بەسەر مێزەکەمدا و بە پشتی پەنجەی تەقەی لەسەر وێنەی هاوسەرەکەم دەدا.

"منیش گووتم، 'سەیرکە چارلس، تۆ تەنها دانیشە و هەموو شتێکم بۆ باس بکە، بەڵێن بێت هەرچیت بووێن بۆت دەکەم.' لەگەڵ وتنی ئەمەدا دانیشت، ئەنجا بەهێوری قسەمان لەسەر کێشەکە کرد."

بەڵێ، مەرج نییە هەموو کاتێك بتوانیت ئاخاوتنی لەم شێوەیە بخەیتە نێو ووتار و قسەکانتەوە، بەڵام دەتوانیت ببینیت چۆن گێڕانەوەی ڕاستەوخۆی قسەی کەسەکان یارمەتیت دەدات ڕووداوەکە بۆ گوێگرەکانت بخەیتە سەر شێوەی دراما. خۆ ئەگەر بێتو قسەکەر بتوانێت لاسایی کەسەکان بکاتەوە و دەنگی خۆی وەك دەنگی بنەڕەتی ئەوان لێ

بکات، ئەوا بابەتەکە بەهێزتر و کاریگەرتر دەبێت. هەروەها ئەو جۆرە ئاخاوتنانە تام و بۆیەکی سروشتیت پێ دەبەخشن. وات لێ دەکات بەشێوەیەك لەبەر چاوی گوێگرەکانت دەرکەویت، وەك ئەوەی کەسێکی سروشتی لەسەر مێزی نانخواردن لەگەڵ کەسێکدا قسە دەکات، نەوەك کەسێك کە خۆی بە زانا بزانێت و هەندێك پەڕەی بەدەستەوە بێت و لەبەردەم کۆمەڵێك کەسی تێگەشتوودا قسە بکات، یان وەك وتاربێژێك لەبەردەم مایکێکدا بشیرێنێت.

## ئەوەی باسی دەکەیت بیهێنە پێش چاوی گوێگر

دەروونناسان پێمان دەڵێن کە زیاتر لە ٨٥٪ی زانیارییەکانمان لەڕێگەی بینینەوە بەدەست دەهێنین. هیچ گومانی تێدا نییە ئەمە ئەو کاریگەرییە گەورەی تەلەفزیۆنەکانیش دەگرێتەوە کە وەك ناوەندێك بۆ بڵاوکردنەوەی ڕیکلام و فیلم و بەرنامەکان کار دەکەن. ووتاربێژی و قسەکردنیش بەهەمان شێوە هونەرێکی دوو جەمسەرە ـ بینین و بیستن. یەکێك لە ڕێگاکان بۆ ئەوەی قسەکان بە زانیاری و وردەکاری دەوڵەمەند بکەین بریتییە لە نواندنی بابەتەکە. ڕەنگە چەند کاتژمێرێکت بوویت تا باسی یاری گۆڵف و چۆنییەتی هەڵدانی تۆپەکەم بۆ بکەیت و منیش بەوە بێزاربم، بەڵام هەستە سەر پێ و پیشانم بدە کاتێك تۆپەکە هەڵدەدەیت چی دەکەیت، ئەوکات منیش هەموو گیانمت بۆ دەکەم بە چاو و گوێ. بەهەمان شێوە ئەگەر بە شان و باڵەکانت باسی فڕین و مانۆڕە

ترسناکەکانی فڕۆکەیەك بکەیت، ئەگەر تا مردنیش قسە بکەیت لەگەڵت دێم.

لەبیرمە لە یەکێك لە خوولەکان بابەتێك پێشکەشکرا کە نموونەیەکی جوان بوو لە نواندن و پیشاندانی بابەتەکان بەشێوەیەکی کردەیی. قسەکەرەکە باسی کەسێکی دیکەی دەکرد، زۆر بەجوانی و بەشێوەیەکی پێکەنیناوی لاسایی کەسەکەی دەکردەوە، زمانی جەستە و ڕەفتارەکانی زۆر تایبەت بوون، بڕوا بکە کاتێك لاسایی ئەو پیاوەی دەکردەوە کە خەریکی چاککردنەوەی ئامێرێك بوو، دیمەنێکی هەبوو لە هەرچی بەرنامەی تەلەفزیۆنی هەیە پێکەنیناویتر و سەرنجڕاکێشتر بوو. ئەمە هەمووی بەهۆی نواندن و پیشاندانی بابەتەکە بوو بەشێوەیەکی کردەیی. هەر لەبەر ئەوەیە تا ئێستاش ئەو دیمەنەم لەبیرە و هیچ کات بیرم ناچێتەوە، دڵنیام تا ئێستاش بەشداربووانی دیکە باسی ئەو بابەتە دەکەن.

شتێکی زۆر باشە گەر لە خۆت بپرسیت، "چۆن بتوانم هەندێك دیمەن و نواندن لە قسەکانمدا بەکار بهێنم؟" چونکە وەك چینییەکان دەڵێن: یەك وێنە هێندەی دە هەزار وشە کاریگەرە.

## چوارەم/ وشەگەلێکی بەرجەستە بەکار بهێنە کە وێنای بابەتەکەت بکات

هەموو ووتاربێژ و قسەکەرێك ئامانجی سەرەکی ئەوەیە سەرنجی گوێگران بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و لەسەر ئەو بارە ڕایان بگرێت. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەش تەکنیکێکی زۆر گرنگ هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمووان

فەرامۆشیان کردووە. پێناچێت وتاربێژە سادەکان لە هەبوونی ئەو تەکنیکە ئاگادار بن. ڕەنگە هیچ کاتێك بیریشیان لێ نەکردبێتەوە. ئەویش ئەوەیە کە وشە بەکار بهێنرێت بۆ ئەوەی لە مێشکی گوێگردا وێنە و دیمەنێك دروست بکەیت. من ئەو ڕێگایەم زۆر بەلاوە پەسەندە. ئەو وتاربێژەی کە خەڵکی حەزیان لێیە گوێی لێ بگرن ئەو کەسەیە کە بابەتەکە بکات بە وێنەیەك و بیخاتە مێشکی گوێگرەوە. ئەوانەی هێما و سیمبولی ناڕوون و بێڕەنگ و تەمومژاوی بەکار دەهێنن، هەمیشە خەریکە گوێگرەگانیان خەویان لێ دەکەوێت. وێنەکان هێندەی ئەو هەوای هەڵی دەمژیت بەلاشن. هیچی تێناچێت، هەمووکات دەتوانیت بەکاریان بهێنیت.

هێربێر سپێنسەر، لە وتارە بەناوبانگەکەیدا دەربارەی "فەلسەفەی شێواز،" ئاماژەی بە گرنگیی ئەو دەستەواژانە کردووە کە لە مێشکی گوێگردا وێنەیەك دروست دەکەن:

"پێویستە خۆمان لە ڕستەی لەم شێوەیە بەدوور بگرین: بەشێوەیەکی ڕێژەیی کاتێك شێواز و داب و نەریت و ڕەفتاری نەتەوەیەك توند و دڕندانە بێت، یاساکانی سزادانیشیان سەخت و توند دەبێت! لەبری ئەوە، پێویستە بەم شێوەیە بنووسین: بەشێوەیەکی ڕێژەیی کاتێك نەتەوەیەك چێژ لە جەنگ، زۆرانبازی، و شەڕەگا وەربگرن، سزاکانیشیان هەڵواسین و سووتاندن و گۆشت لێکردنەوە دەبێت."

ئەگەر سەرنجی ئینجیل و بەرهەمەکانی شەیکسپیر بدەیت، پڕن لەو دەستەواژانەی کە وێنەیەك لە مێشکی خوێنەردا دروست دەکەن. بە نموونە، نووسەرێکی ئاسایی گەر بیەوێت بڵێت فلانە شت بێ

کەموکورتییە، دەڵێت "زۆر نایابە." بەڵام ئەی شەیکسپیر چۆن هەمان مەبەست دەگەیەنێت؟ قسەکانی لەشێوەی وێنەدا دەکات و هیچ کات بیر ناچنەوە، بەنموونە گەر بیەوێن بڵێت فلان شت زۆر نایابە، دەڵێت: زاخاوی زێڕی پووخت دەکات، گوڵە شلێر ڕەنگ دەکات، بۆنی گوڵە وەنەوش دەدات.

ئایا هیچ کاتێك وەستاویت بیر لەو پەندانە بکەیتەوە کە نەوە لەدوای نەوە بۆمان ماوەنەتەوە و زۆربەی هەرە زۆریان لەشێوەی وێنەدان؟ "هەشتبێ و لە مشت بێ، نەك نۆ بێ و نەبێ." "دەگرمێنێ و نابارێنێ." "دەیباتە سەر ئاو و ئاویشی ناداتێ." دەبینیت هەموو پەندەکان بەشێوەیەکی وێنەیی باسکراون، لەبەر ئەوەیە بۆ چەندین سەدە ماونەتەوە و بەکارهێنانێکی زۆریشیان هەیە.

هەموو کاتێك لینکن بەشێوەی وێنەیی قسەی دەکرد. جارێکیان لە کۆشکی سپیدا لەلایەن بەردەستەکانییەوە کۆمەڵێك ڕاپۆرتی دووردرێژ و ئاڵۆزی بۆ هات، هەموویانی ڕەت کردەوە، بەڵام نەك بەوشەی سادە و بێڕەنگ و بۆ، بەڵکوو بە دەستەواژەی وێنەیی کە زەحمەت بوو لەبیر بکرێت. وتی، "کاتێك کەسێك دەنێرم ئەسپێك بکرێت، نامەوێت پێی بڵێن کلکی چەند تاڵە مووی پێوەیە. تەنها دەمەوێت مەبەستەکەی بزانم."

ئالیان، فەیلەسوفی فەڕەنسی، دەڵێت، " هەموو کاتێك شێواز و ستایلی واتایی خراپە. پێویستە ڕستەکانت پڕبن لە شتی بەرجەستەی وەك بەرد، کورسی، کانزا، مێز، ئاژەڵ، ژن، و پیاو."

ئەمە بۆ هەموو گفتوگۆ و قسەکردنێکیش ڕاستە. لەڕاستیدا، هەمو ئەوەی لەم بەشەدا وتراوە لەبارەی بەکارهێنانی وردەکاری و زانیاری

دەقیە لە قسە و ووتارەکاندا، بۆ هەموو گفتوگۆیەکی گشتی دەگونجێت. باسکردنی وردەکارییەکان وا دەکات گفتوگۆکە درەوشاوە بێت و بگەشێتەوە. هەر کەسێك گەر دەیەوێت ببێتە قسەکەرێکی سەرنجڕاکێش، دەتوانێت بە شوێنکەوتنی ئەو ئامۆژگاریانەی لەم بەشەدا باسکراون خۆی سوودمەند بکات. گەر فرۆشیارانیش لە ناساندنی کاڵاکانیاندا وردەکاری باس بکەن، هەست بە گۆڕانکارییەکی ئەفسوناوی دەکەن لە ڕێژەی فرۆشیاندا.

## ((بەشی پێنجەم))

# قسەکانت ببوژێنەوە

ڕاستەوخۆ دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە لەندەن بووم لەگەڵ لۆویل تۆماس کارم دەکرد، تۆماس خەریکی پێشکەشکردنی زنجیرە وتارێکی تایبەت بوو بۆ خەڵکێکی زۆر لەسەر نیمچەدوورگەی عەرەب. ئەو ماوەی لە لەندەن بووم هەنێك بەناو شاردا گەڕام.یەکشەممەیەکیان بەناو پارکی هایدی'دا دەگەڕام بۆ ئەوەی ماربڵ ئارك بدۆزمەوە، ماربڵ ئارك یەکێك بوو لە دەروازە سەرەکییەکانی پارکەکە کە هەموو وتاربێژ و قسەکەرێکی جیاواز لە ئایین، ڕەنگ، مەزهەب، بیروبۆچوونی سیاسی لێبوو، هەموو کەسێك بەبێ بەربەستی یاسای ئازدبوو قسەی خۆی بکات. بەو ناوەدا کەمێك گەڕام، بۆ ماوەیەك گوێم لە کەسێکی کاسۆلیکی بوو باسی بێهەڵەیی و بێ کەم و کورتیی پاپای دەکرد، دواتر چوومە نزیك کۆمەڵێکی دیکە، گوێم لە کەسێکی سۆسیالیستی بوو باسی مارکسی دەکر. وردە وردە خۆم کرد بە سێهەم کۆمەڵدا، قسەکەرەکە باسی ئەوەی دەکرد بۆچی پیاو دەتوانێت چوار ژن بهێنێت. دواتر ڕۆشتم و پشتم لە هەر سێ کۆمەڵەکە کرد.

ئایا بڕوا بەوە دەکەیت؟ ئەو پیاوەی باسی فرەژنی دەکرد تەنها چەند کەسێکی کەمی لەدەور بوو، دوانەکەی دیکە سات بە سات گوێگرەکانیان زیادی دەکرد. لە خۆمم پرسی باشە ئەمە بۆ؟ ئایا بەهۆی جیاوازی

بابەتەکەوە بوو؟ بڕواناکەم ئەوە بووبێت. ئەوەندەی من بزانم وەڵامەکە لە خودی قەسەکەرەکاندا هەست پێدەکرا، ئەو هاوڕێیەی باسی سوودەکانی چوار ژنی دەکرد، پێیەوە دیار بوو خۆی زۆر حەزی لە چوار ژن نەبوو، بەڵام دوو وتاربێژەکەی دیکە، کە قسەکانیان لە گۆشە نیگایەکی تەواو جیاوازەوە بوو، تەواو لە بابەتەکەدا قووڵ بووبوونەوە، بە گیان و ڕۆحێکی تەواو بەهێزەوە قسەیان دەکرد. دەستیان لەڕادەبەدەر دەجوڵاند. لە دەنگیاندا هەستت بە باوەڕ دەکرد، گەرموگوڕی و پەرۆشییان لێ دەچۆڕا.

بووژانەوە، زیندوویێتی، و پەرۆشی ـ هەموو کاتێك وەك بنەڕەت و کرۆکی قسەکردن ئەمانەم بینیووە.

ئایا چۆن بتوانیت بەشێوەیەك قسە بکەیت کە سەرنجی گوێگر لای خۆت بهێڵیتەوە؟ بەدرێژایی ئەم بەشە سێ شارێگات پێدەدەم کە یارمەتیت دەدەن چوست و چالاك بیت و بە بە تامەزرۆییەوە بدوێیت و قسەکانت بوژێنیتەوە.

## یەکەم/ بابەتێك هەڵبژێرە کە خۆت تامەزرۆی بیت

لە بەشی سێیەمدا باسمان لە گرنگیی قوڵبوونەوە لە بابەتەکەتدا کرد. ئەگەر لەڕووی هەست و سۆزەوە لەو بابەتەی بۆ قسەکردن هەڵتبژاردووە قووڵ نەبیتەوە، ناتوانیت وا لە گوێگرەکانت بکەیت بڕوات پێ بکەن. ئەگەر بابەتێك هەڵبژێریت کە حەزت لێی بێت و ئەزموونێکی دووروودرێت هەبێت لەگەڵیدا (وەك خۆزگەیەك یان حەزێکی منداڵی)، یان بابەتێك بێت کە بیرکردنەوەیەکی قووڵ یان خەمێکی گەورەت هەبێت بۆی (بە نموونە

کۆمەڵگا پێویستی بە دابینکردنی قوتابخانەی باشترە)، ئەوکات هیچ ئاستەنگێکت بۆ دروست نابێت و بە تامەزرۆییەوە قسەی خۆت دەکەیت و سووریت لەسەر بابەتەکەت. ٢٠ ساڵ لەمەو پێش لە نیویۆرك لە یەکێك لە خولەکانمدا وتارێکیان پێشکەش کرد، هیچ کاتێك هێندەی ئەو کاتە کاریگەری گەرموگوڕی و پێداگیریم بەچاوی خۆم نەبینیبوو. گوێم لە زۆر قسەی قایلکەر بووە، بەڵام تەنها و تەنها ئەو دانەیان وەك جەنگاوەر بەسەر هەموویاندا سەرکەوت.

باشترین فرۆشیاری یەکێك لە بەناوبانگترین دامەزراوەکانی وڵات قسەیەکی زۆر سەیری کرد، وتی: بەبێ تۆو یان ڕەگ گیا دەڕوێنێت. بەپێی چیرۆکەکەی خۆی، دەیگووت خۆڵەمێشی درەختی هیکی بەناو زەوییەکدا بڵاوکردووەتەوە کە تازە کڵابووی[٤]. دوای ماوەیەکی کەم گیا سەوزبووبوو! زۆر دڵنابوو لەوەی ئەو خۆڵەمێشە، تەنها ئەو خۆڵەمێشە، بووە هۆی ئەوەی گیا بڕوێت.

منیش لێدوانم لەسەر قسەکانی دا و بەنەرمونیانی گووتم: ئەم داهێنانە نوێیەی، ئەگەر ڕاستبێت، دەیکات بە ملیۆنەر، لەبەر ئەوەی تۆوی ئەو جۆرە گیایە قوتوی بە چەند دۆلارێك بوو. ئەوەشم پێگووت کە ئەم داهێنانەی دەیکات بە دیارترین زانای مێژوو. پێم ڕاگەیاند کە هیچ کەسێك، مردوو و زیندوو، تا ئێستا نەیتوانیوە خۆی موعیزە ئەنجام بدات: هیچ کەسێك نەیتوانیووە لە شتێکی بێگیان شتێکی زیندوو بەرهەم بهێنێت.

---

[٤] هیکی جۆرە درەختێکە لەشێوەی دار گوێز - وەرگێڕ.

بەبێدەنگی پێم گووت ئەو هەڵەی ئەو کردی بەرهەڵستی زۆری دەکەن، قسەکەی مایەی گاڵتەجاڕییە، بەم شێوەیە زۆر بەڕاستەوخۆیی بەدرۆم نەخستەوە. کاتێك تەواو بووم، هەمووان هەستیان بە گەمژەیی ئەو کابرا دەکرد، بەڵام خۆی بۆ ساتێکیش هەستی پێ نەدەکرد. زۆر سوور بوو لەسەر بۆچوونەکەی. هەستایە سەر پێ و پێی گووتم هەڵە نییە. بەناڕەزاییەکەوە وتی خۆ من باسی تیۆر ناکەم، باسی تاقیکردنەوە دەکەم. خۆی دەیزانی باسی چی دەکات. بەردەوام بوو لە قسەکردن، مەودای قسەکانی فراوانتر دەکرد، زانیاری زیادەی پێ دەداین، تا دەهات بەڵگەی زیاتری لەسەر یەك کەڵەکە دەکرد، لە قسەکانیدا پێداگیری و سووربوونێکی زۆری پێوە دیار بوو.

جارێکی دیکە پێم ڕاگەیاندەوە کە هیچ هیوایەك نییە لەوەی ڕاست دەرچێت یان نزیکیش بێت لە ڕاستییەوە، تەنانەت سەدان کیلۆمەتیش لە ڕاستییەوە نزیك نەبووەتەوە. هەم دیسان جارێکی دیکە زۆر بەخێرایی هەستایە سەر پێ، وتی با لەسەر ٥ دۆلار گرەو بکەین[٥]، وەزارەتی گشتوکاڵیش دەکەین بە ناوبژیوانمان.

ئایا دەزانی دواتر چی ڕوویدا؟ دوای ئەوەی ئەوەندە سووربوو لەسەر قسەکانی چەند کەسێك لە ئامادەبووان بیرکردنەوەیان گۆڕا و لایەنگیریان کرد، زۆرێکی دیکە کەوتنە گومانەوە. ئەگەر دەنگدانم بکردایە، دڵنیا بووم نیوەی دەنگەکان پشتی منیان نەدەگرت. لێم پرسین چی شتێك وایکرد بیروڕایان بکەوێتە لەرزە. یەك لە دوای یەك دەیانگووت بەهۆی

[٥] لە ساڵانی ڕوودانی ئەم ڕووداوەدا، نرخی ئەو پێنج دۆلارە بەنزیکەیی ١٠٠٠ دۆلاری ئێستا بووە - وەرگێڕ.

ئەوەی کابرا زۆر سووربوو، بڕوای بەهێز بوو، ئەوەندە بە پێداگیرییەوە باسی دەکرد، وای لێکردین گومان لە بۆچوونە گشتییەکەی خۆان بکەین. بەڵێ، بۆ ئەوەی ئەو ساویلکەییە لە وەزارەتی کشتوکاڵەوە دڵنیا بکەمەوە، نووسراوم بۆ کردن و هەموو شتێکم پرسی. پێم گووتن شەرمەزاریشم پرسیارێکی بێمانای لەو شێوەیە دەکەم. وەڵامیان دایەوە و گووتیان بەدڵنیاییەوە ئەستەمە گیا یان هەرشتێکی دیکەی زیندوو لە خۆڵەمێشەوە دروست بکرێت، هەروەها ئەوەشیان نووسیبوو کە نامەیەکی دیکەیان لە نیو یۆرکەوە پێگەشتبوو کە هەمان پرسیاری کردبوو. ئەو کابرا ئەوەندە لە بۆچوونەکەی خۆی دڵنیا بوو ئەویش دانیشتبوو نامەی نووسیبوو!

ئەم ڕووداوە وانەیەکی فێرکردم کە هەرگیز بیرم نەچێتەوە. ئەگەر کەسێك (وتاربێژێك) بڕوای بە شتێك هەبێت و زۆر سووربێت لە باسکردنیدا، تەواو شتەکە بەلایەوە دەبێت بە ڕاستی و هیچ شتێك ساردی ناکاتەوە، تەنانەت ئەگەر بڵێت لە خۆڵ و خۆڵەمێش بەبێ تۆو گیا دەڕوێنم. ئەی باشە ئەوە کەسێك بە بیرکردنەوەیەکی هەڵەوە توانی گوێگر بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، ئەی ئەگەر بێتو بۆچوونەکانمان لەگەڵ ڕای خەڵکیدا تەبا و ڕست و دروست بن، ئەوەندەش پێدگیربین لەسەریان، دەبێت چەندە کاریگەر و سەرنجڕاکێش بن و سەرنجی گوێگر ڕاکێشن!

زۆربەی هەرە زۆری ووتاربێژان خەمی ئەوەیانە بابەتەکەیان سەرنجی گوێگر ڕابکێشێت. تەنها یەك ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی دڵنیابیت گوێگرەکانت حەزیان لە بابەتەکەتە: دەبێت ئاگری پێداگیری و پەرۆشی بۆ ئەو بابەتە

داگیرسێنیت، ئەوکات بەئاسانی سەرنجی هەمووان بەلای خۆتدا ڕادەکێشیت.

ماوەیەکی کەم پێش ئێستا، گوێم لێبوو پیاوێك گوێگرەکانی لەوە ئاگادار دەکردەوە کە، ئەگەر بێت و ڕاوەماسی لە بەنداوی چێسەپیك بەم شێوەی ئێستا بەردەوام بێت، لە چەند ساڵێکی کەمدا جۆرە ماسییەکی ئەو ناوچە هەیە لەناودەچن! لەناخەوە هەستی بەو بابەتە دەکرد و خەمی بۆ دەخوارد، بە گرنگی و تامەزرۆییەوە قسەکانی دەکرد، بابەتێکی گرنگ بوو بەلایەوە. ئەو کابرایە زۆر بەپەرۆش بوو، هەموو قسەکان و شێوازی هەڵسوکەوتی ئەوەی پێوە دیاربوو. یەکەم جار کە هەستا قسە بکات، زۆر کەمم دەزانی لەسەر ئەو جۆرە ماسییە. دمزانی زۆرێك لە گوێگران هەمان حاڵی منیان هەبوو، شتێکی کەمیان لەو بارەیەوە دەزانی، بەڵام پێش ئەوەی کابرا لە قسەکانی تەواو بێت، هەموومان ئامادەبووین سکاڵا تۆمار بکەین و واژۆ دژی ئەو کارە پێشکەش بە دەسەلاتی یاسادانان بکەین تاوەکوو ئەو جۆرە ماسییە بەپێی یاسایە پارێزراو بێت.

جارێکیان پرسیاریان کرد لە ڕیچارد واشبێرن، باڵوێزی پێشووی ئەمریکا لە ئیتالیا، وەك نووسەرێکی بلیمەت نهێنی سەرکەوتنەکانی چییە. وەڵامی دایەوە و وتی: "تانها ئەوە بە خەڵکی دەڵێم: من ئەوەندە حەزم ژیانی خۆمە نازانم چی بکەم." بڕوا ناکەم کەس هەبێت بەو جۆرە ووتاربێژ و نووسەرانە سەرسام و دڵبەند نەبێت.

جارێکیان چووم بۆ لەندەن بۆ ئەوەی گوێ لە ووتاربێژێك بگرم: دوای ئەوەی تەواو بوو، یەکێك لە هاوڕێکانم، بەڕێز بێنسن ڕۆماننووسی

بەناوبانگی ئینگلیزی، وتی کە حەزی لە کۆتا بەشی قسەکانی ووتاربێژەکە کرد. کاتێك لێم پرسی بۆچی، وتی: "قسەکەر لە کۆتا بەشدا خۆی زۆر تامەزرۆ بوو، منیش هەموو کاتێك چاوەڕێی قسەکەر دەکەم تامەزرۆیی و گەرموگوڕی پێوە دیاربێت."

ئەمەش بەسەرهاتێکی دیکەیە کە گرنگی هەڵبژاردنی بابەتێکی باش دەردەخات.

پیاوێکی بەڕێز، کە ناوی بەڕێز فلین بوو، لە یەکێك لە خولەکانماندا لە واشنتن خۆی ناونووس کرد. لە ئێوارەیەکی سەرەتای خولەکەدا، بڕیاریدا ووتارێك پێشکەش بکات، قسەکانی تایبەت کردبوو با باسکردنی پایتەختی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بۆ ئامادەکردنی بابەتەکەی چووبوو بەسەرپێیی و شپرزەیی زانیارییەکانی لە نامیلکەیەکەوە گوڵەوەچن کردوو، زانیارییەکانی وەك نامیلکەکە خۆی بوون ــ وشك، بێسەروبەرە، ناڕوون. کابرا خۆی چەندین ساڵ لە واشنتن ژیابوو، کەچی نەیتوانی یەك شتی تایبەتیمان پێ بڵێت بۆچی خودی خۆی حەزی لەو شارەیە. تەنها کۆمەڵێك زانیاری بێزارکەری دووبارە دەکردەوە و بەس. خۆی چەندە دەترسا لە پێشکەشکردنی ووتارەکەی ئێمەش ئەوەندە بیزاربووین بە قسەکانی. دووهەفتە دواتر، شتێك ڕوویدا کە ناخی بەڕێز فلین ی هەژاند: هەرچەندە لە شوێنی گونجاودا ڕایگرتبوو، بەڵام شۆفێرێکی نەناسراو خۆی دابوو بە ئۆتۆمبیلە نوێیەکەیدا و ورد و خاشی کردبوو، ئەنجا کابرا پێی لێدابوو ڕۆشتبوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەڕێز فلین لەلایەن حکومەتەوە پارەی بۆ خەرج نەکرێت چونکە بەڵگەی نەبوو، بۆیە دەبوو لەسەر ئەرکی خۆی ئۆتۆمبیلەکەی چاك بکاتەوە.

ئەوە شتێك بوو کە گەرماوگەرم بەسەریدا هاتبوو. کاتێك باسی شاری واشنتنی دەکرد، بەزەحمەت ڕستەیەکی بۆ دەهات و خۆی و گوێگرەکانیشی بێزار بووبوون، بەڵام کاتێك باسی ئۆتۆمبیلە شکاوەکەی کرد، بەلێشاو قسەی لەدەم دەردەهات و دەتگووت بورکانە هەڵدەقوڵێت. ئەو کەسانەی کە پێشتر لە ووتارەکەی دیکەیدا شوێنیان بە خۆیان نەدەگرت و حەوسەڵەی گوێگرتنیان نەبوو، ئێستا بە چەپڵەڕێزانێکی گەرم دەستخۆشیان لە بەڕێز فلین دەکرد.

چەند جارێکی دیکەش گوتوومە، ئەگەر بابەتێکی گونجاو بۆ خۆت هەڵبژێریت، جگە لە سەرکەوتن هیچی دیکە بەدەست ناهێنیت. یەك لایەن هەیە زۆر دڵنیایی تێدایە بۆ ئەوەی بیکەیت بە بابەتی قسەکردن: باسی بیرکردنەوە و بیروڕای خۆت بکە! بەدڵنیاییەوە تۆیش وەك هەر کەسێکی دیکە لە هەندێك لایەنی ژیاندا بیروڕای بەهێز و چەسپاوت هەیە. هەموویان لە مێشکی خۆتدان و هەمووکات بۆ بەکارهێنان بەردەستن.

ماوەیەکی زۆر نابێت لە دادگاوە بابەتی جێبەجێکردنی یاسای لەسێدارەدان تاوتوویێ دەکرا و لە تەلەفزیۆنەوە دەگوازرایەوە. زۆر کەسی گەواهیدرە (شایەت) بانگکران تاوەکوو بۆچوونی خۆیان لەسەر ئەو یاسایە بخەنەڕوو. یەکێك لەو کەسانەی کە قسەی کرد پۆلیس بوو لە لۆس ئەنجەلۆس. ئەو پۆلیسە بۆچوونی زۆر جوانی دەربڕی و بە بەڵگەوە قسەی لەسەر بابەتەکە دەکرد. بڕوا و قەناعەتی زۆر بەهێز بوو بە قسەکانی، لەبەر ئەوەی یانزە پۆلیسی هاوڕێی لە شەڕدا لەلایەن هاوڵاتیانەوە بەهۆی شەڕە تەقەوە کوژرابوون. لە قسەکانیدا زۆر بەپەرۆش بوو، وەك کەسێك قسەی دەکرد کە لەناخی دڵییەوە بڕوای بە

ڕاستی و دروستی قسەکانی هەبێت. هەموو جوانییەکی ڕەوانبێژی لە بیروبۆچوون و هەستی قووڵی ئەو کەسەدا بەدی دەکرا. بەڵێ، دڵسۆزی و پەرۆشی لە قسەدا بەندە بە ئاستی بیرکردنەوە و بڕواوە، بیرکردنەوە و بڕوایش چەندێك لە مێشکدایە ئەوەندەش لە دڵدایە. لە زۆرێك لە خولەکانمدا هەمووکات بۆ ئەوەی ڕستە باوەکەی پاسکاڵ بەبیر هەمووان بهێنمەوە چەندین نموونەی جۆربەجۆرم دەهێنایەوە. "دڵ هەندێك هۆکاری هەیە کە مێشك نایانزانێت."

پێشنیارێکی دیکەشم هەیە بۆت: زۆر شت بخوێنەوە لەسەر ئەو ناونیشانەی کە پێتوایە گونجاوە بۆ قسەکردن لەسەری، وە زیاتر و زیاتر فێربە. تا زیاتر لەبارەی شتێکەوە بزانیت، بەپەرۆشتر و تامەزرۆتر دەبیت لە باسکردنیدا. پێرسی وایتینگ، نووسەری کتێبی *پێنج یاساکەی فرۆشتن*، دەڵێت: فرۆشیار نابێت هەرگیز لە فێربوون و شارەزابوونی ئەو کاڵا و بەرهەمانە بووەستێت کە دەیانفرۆشێت. وەك ئەوەی بەڕێز وایتینگ دەڵێت، "هەتا زیاتر بزانیت لەسەر بەرهەمێکی باش، زیاتر بەبایەخ دەبێت بەلاتەوە و تامەزرۆی دەبیت." هەمان شت بۆ بابەتەکەیشت ڕاستە ـ تا زیاتری لەبارەوە بزانیت، زیاتر بەبایەخ دەبێت بەلاتەوە و تامەزرۆی باسکردنی دەبیت.

### دووەم/ هەستەکانت لە بابەتەکەدا زیندوو بکەرەوە

وای دابنێ باسی ئەوە بۆ گوێگرەکانت دەکەیت کە بەهۆی خێراییەو پۆلیسی هاتووچۆ ڕایگرتوویت. ئەگەر وەك کەسێکی چاودێر کە ڕووداوەکەی بینیووە، بەشێوەیەکی سادە و ئاسایی لە زمانی کەسێکی

دیکەوە باسی حاڵەتەکەمان بۆ بکەیت، ئەوکات هیچ تام و چێژی نابێت، بۆیە دەبێت بەناوی خۆتەوە ڕووداوەکان بگێڕیتەوە، چونکە ئەو ڕووداوە بەسەر تۆدا هاتووە و هەستێکی تایبەتیت بۆ دروست بووە کە تەنها خۆت دەتوانیت باسیی بکەیت. بۆیە کاتێك کەسێکی دیکە ئەو قسانەت دەبیستێت هیچ کاریگەر نابێت پێی. گوێگر دەیەوێت بزانێت هەستت چۆنبوو کاتێك پسوڵەی سەرپێچی بۆ کردیت. بۆیە تا زیاتر ئەو دیمەنەی باسی دەکەیت زیندووتر بێت، یان تا زیاتر ئەو هەستە بەرجەستە بکەیت کە سەرەتا بۆت دروست بووبوو، ڕوونتر دەتوانیت گوزارشت لە ناخی خۆت بکەیت.

کەوابوو کاتێت ووتار دەدەیت و قسە بۆ خەڵك دەکەیت، بەپێی ئەو ڕێژە تامەزرۆییەی دەیخەیتە ناو قسەکانت گوێگرەکانت تامەزرۆ دەکەیت. هەستە ڕاستەقینەکانت کپ مەکەرەوە. بۆ گوێگرەکانت بسەلمێنە زۆر تامەزرۆیت باسی ئەو بابەتە بکەیت، ئەنجا دەبینیت چۆن سەرنجی گوێگرەکانت ڕادەکێشیت.

## سێیەم/ بە شێوەیەکی چوست و چالاك بجوڵێ

کاتێك دەتەوێت لەبەردەم گوێگرەکانتدا قسە بکەیت، بە چوست و چالاکی قسە بکە، نەك مات و مەلول وەك ئەو کەسە بیت کە ملی بە پەتی سێدارەوەیە. کاتێك دەچیتە سەر دوانگە هەوڵ بدە چوست و چالاك و گورجوگۆڵ بیت لەکاتی ڕۆشتندا، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرنجی بەرانبەر ڕاکێشیت و گوێگر وا هەست بکات شتێکت پێیە و زۆر بەپەرۆشی باسی بکەیت. پێش ئەوەی دەست پێبکەیت،

هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە. دوور بکەوە لەو مێزە یان لەو دوانگەی بۆت دانراوە قسەی لەسەر بکەیت. سەرت بەرز بکە و چەناگەت دەربپەڕێنە. تۆ شتێکی بەنرخ بەگوێگرەکانت دەڵێیت، بۆیە دەبێت هەموو بەشێکی جەستەت بەڕوونی و بەبێ هەڵە ئەو شتە بڵێت. وەك ولیام جەیمس دەڵێت: تۆ خاوەن دەسەڵاتیت و هەمووو شت لەژێر دەستی خۆتدایە. بۆیە بەو شێوەیە ڕەفتار بکە. ئەگەر بتەوێت قسەکانت بگات بە کۆتا کەسی ناو هۆڵەکە، دەنگت هاوکاریت دەکات بۆ ئەو کارە، بەڵام ئەگەر هەموو جۆرە جوڵە و ئاماژەیەکی جەستەت بەکارهێنا، ئەوان (گوێگرەکان) هاوکاریت دەدەن. لە سەروو هەمووشیەوە ئەمەت لەبیر بێت: ڕەفتارکردن بە گەرموگوڕی هەستێکی گەرموگوڕت پێدەبەخشێت.

## ((بەشی شەشەم))

## با قسەکانت گوزارشت بێت لە ژیانی گوێگرەکانت

---

وتارە بەناوبانگەکەی ڕوسێڵ کەنوێڵ "مشتێك لە ئەڵماس،" نزیکەی شەش هەزار جار پێشکەش کراوە. ڕەنگە پێت وابێت ووتارێك کە ئەوەندە دووبارە کرابێتەوە ئێستا بەجۆرێك لە مێشکی ووتاربێژەکەدا چەسپابێت کە لەکاتی قسەکردندا یەك وشە یان یەك ئاواز لە قسەکانی لەبیر نەچێتەوە وەك خۆی دووبارەیان بکاتەوە. بەڵام بابەتەکە ئەوە نییە. دکتۆر کەنوێڵ دەیزانی گوێگرەکان جیاوازن لەیەکتر. لەوە تێگەشتبوو کە دەبێت کارێك بکات هەموو یەکێك لە گوێگرەکانی وا هەست بکات قسەکانی بۆ ئەو دەکات، تەنها ئەو. ئایا دکتۆر کەنوێڵ چۆن توانی لە ووتارێکەوە بۆ ووتارێکی دیکە پەیوەندی نێوان قسەکەر و قسەکان و گوێگرەکان بپارێزێت؟ بەم جۆرە نوسیبووی، "سەردانی شارێکم دەکرد، ئەنجا هەوڵم دەدا زۆر زوو بگەمە ئەوێ بۆ ئەوەی چاوم بە پۆستەچییەکان، سەرتاشەکان، بەڕێوبەری ئوتێلەکان، بەڕێوبەری قوتابخانەکان، هەندێك کاربەدەست و وەزیر بکەوێت و بزانم ڕابردوویان چۆنە و کار و پیشەیان چۆن بەڕێوەدەچێت، لە ژیانیاندا چی دەرفەتێکیان بۆ ڕەخساوە. دواتر ووتارەکەم پێشکەش دەکەم و باسی ئەو بابەتانە بۆ گوێگرەکانم دەکەم کە لە ژیانی ئەوانیشدا ڕەنگی داوەتەوە."

دکتۆر کەنوێڵ زۆر باش لەوە تێگەشتبوو گفتوگۆی سەرکەوتوو بەندە بەوەی تا چەند قسەکەر دەتوانێت بەباشی قسەکانی بکات بە بەشێك لە

گوێگرەکانی و گوێگرەکانی بکات بە بەشێك لە قسەکانی. دکتۆ کەنوێڵ بە تێگەشتنە ژیرانەکەی خۆی لە سروشتی مرۆڤ و تێگەشتن لە بوارەکەی خۆیشی توانی چەندین جار ووتارەکەی بۆ خەڵکی جیاواز دووبارە بکاتەوە هیچیشیان لەیەك نەچێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە زۆربەی هەرە زۆری ووتارەکانیدا لەسەر هەمان بابەت بۆ گوێگری جیاواز قسەی دەکرد. تۆش دەتوانیت لەم نموونەیەوە سوود وەرگریت و هەموو کات کە ووتارەکانت ئامادە دەکەیت کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراوت لەمێشکدا بێت. چەند یاسایەکی سادەمان هەیە کە دەتوانیت بەکاریان بهێنیت بۆ دروستکردنی هۆگریی و پەیوەندی لە نێوان خۆت و گوێگردا.

### یەکەم/ باس لە حەزی گوێگرەکانت بکە

دکتۆر کەنوێڵیش کتومت هەمان شتی کرد. لە ووتارەکانیدا ژمارەیەکی زۆر نموونە و بەسەرهاتی باس دەکرد. هەمووان تامەزرۆی قسەکانی بوون چونکە پەیوەست بوو بە ژیانی خۆیان و خۆشی و ناخۆشییەکانیانەوە. ئەم پەیوەندییە لە نێوان قسەکان و خودی گوێگرەکاندا دڵنیاییت پێدەبەخشێت لە ڕاکێشانی سەرنجی گوێگرەکانت و گرەنتی ئەوەت پێدەدات قسەکانت لەبیر ناکرێن. ئێریك جۆنسن، سەرۆکی پێشووی ژووری بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە زۆربەی قسەکانیدا ئەم تەکنیکەی بەکاردەهێنا. لە زانکۆی ئۆکلاهۆما بابەتێکی پێشکەش کرد، زۆر بەجوانی باسی لەو شتانە دەکرد کە بەدڵی گوێگرەکانی بوو. باسی شوێنەکانی ئۆکلاهۆمای دەکرد، باسی لەوە دەکرد خەڵکەکەی کاتی خۆی بەم شێوەیە خزمەتیان کردووە و بەو شێوەیە باش بوون.

وای لە ئامادەبووان کردبوو وەك ئەوەی باسی خوودی ئەوان دەکات. هیچ گوێگرێك خەیاڵی لای قسەکەرێك ناڕوات کە باسە لە حەز و ئارەزووەکانی بکات.

لە خۆت بپرسە بزانە بابەتەکەت چۆن هاوکاری ئامادەبووان دەکات کێشەکانیان چارەسەر بکەن و ئامانجەکەیان بەدەست بهێنن. دواتر بە گوێگرەکانیشت بڵێ بەو شێوەیە دەتوانن سوود لە قسەکانت وەربگرن، ئەوکات بەتەواوەتی سەرنجی قسەکانت دەدەن و دڵیان لای تۆ دەبێت. بە نموونە، ئەگەر کەسێکی ژمێریاریت و بەم شێوەیە دەست پێبکەیت، "دەمەوێت پێتان بڵێم چۆن خەرجیتان کەم بکەنەوە و هەمان پێداویستیش پڕ بکەنەوە،" یان پزیشکیت و بە ئامادەبووان دەڵێیت چۆن وا بکەن ڕەنگی پێستیان بەبێ بەکاهێنانی دەرمان جوان بێت، ئەوە دڵنیابە لەوەی گوێگرێکانت بەبایەخەوە لە قسەکانت دەڕوانن. بەدڵنیاییەوە لە باگراوەند و کۆگای زانیارییەکانتدا هەندێك بابەت هەن کە یارمەتیدەری ڕاستەقینەی گوێگرەکانتن، بۆیە هەرگیز بەکەم لە زانیارییەکانت مەڕوانە.

کاتێك پرسیاریان لە ویلیام ڕاندۆڵ، ڕۆژنامەنووسی بەریتانی کرد خەڵکی بایەخ بەچی دەدەن. وتی، "خۆیان." لەسەر ئەو تاکە قسەی ئیمپراتۆرییەتێکی مەزنی لە جیهانی ڕۆژنامەوانیدا بۆ خۆی دروست کرد.

جارێك لە کۆبوونەوەیەکدا کە بۆ بەشدابووانی یەکێك لە خولەکانمان سازمان کردبوو، هارۆڵد دوایت کە یەکێك بوو لەو بەشداروانە، لەکۆتا وانەی خولەکەدا ووتارێکی زۆر سەرنجڕاکێشی پێشکەش کرد. بەڕێز باسی هەموو ئەو کەسانەی کرد کە لەوێدا ئامادە بوون: چۆن ئەو کەسە

لەسەرەتای خولەکەدا قسەی دەکرد، چۆن دواتر فێربوو. باسی ئەو ووتارانەی دەکرد کە بەشداربووان پێشکەشیان کردبوو، ئەو بابەتانەی قسەیان لەسەر کردبوو، لاسایی هەندێکیشیانی دەکردەوە، هەندێك لە ساتە نامۆ و سەیرەکانی دەگێڕایەوە و پێوەنانی بۆ دەکرد، هەمووانی خستبووە پێکەنین، هەمووانی زۆر خۆشحاڵ کردبوو، بەڕاستی زۆر نموونەیی بوو. هیچ شتێکی دیکە لەم دونیایەدا ئەوەندەی ئەو قسانە لای گوێگرەکان بایەخ و تام و چێژی نەبوو. بەڵێ، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی هارۆڵ دوایت دەیزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا بکات. بۆیە هەموو کات هەوڵ بدە قسەکانت پەیوەست بە بە گوێگرەکانتەوە.

جاری داهاتوو کە ڕووبەڕووی کۆمەڵە گوێگرێك بوویتەوە، وای دابنێ زۆر تامەزرۆن گوێ لە قسەکانت بگرن. هەر ووتاربێژێك نەتوانێت ئەم شێوە بیرکردنەوەی بەرانبەر گوێگرەکانی هەبێت، ئەوکاتە لە بارودۆخێکدا خۆی دەبینەێتەوە کە ئامادەبووان و گوێگرەکانی هەر یەکەو بەشێوەیەك کات دەژمێرن و تەمەننا دەکەن زوو ڕزگاریان بێت: یەکێك شوێن بەخۆیەوە ناگرێت، یەکێك لەبێزاریدا هەر ئەمدیو ئەودیوەتی، تەماشای کات دەکات، تەماشی دەرگاکە دەکات و خەیاڵ بە تەواوبوونەوە دەکات.

## دووەم/ لە دڵەوە سوپاس و پێزانینی خۆت دەربڕە

بینەر و گوێگر لە چەند تاکێکی سەربەخۆ پێکهاتوون، و بەشێوەی تاکیش پەرچەکرداریان دەبێت. گەر بەڕاشکاوی ڕەخنەیان لێ بگریت، بێزار دەبن. سوپاس و پێزانینی خۆت بۆ ئەو کارەیان دەربڕە کە شایستەی سوپاسکردنە، ئەوکات پاسپۆرتی چوونە ناو دڵیانت

دەستدەکەوێت. لەم جۆرە ستایشکردنەدا دەبێت بزانیت چی دەڵێیت. پیاهەڵدانێکی لەم شێوەیە، "ئێوە باشترین کەسانێکن تا ئێستا قسەم بۆ کردبن،" بەلای زۆربەی گوێگر و بیسەرەوە درۆ و ماستاوکردنە.

وەك ووتاربێژێکی لێزان دەبێت شتێکیان لەبارەی خۆیانەوە پێ بڵێیت کە نەزانن تۆ ئەو شتە دەزانیت. بە نموونە، بۆ کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆ قسە دەکەیت، باسی بەشەکەی خۆیان بکە: بەرزترین نمرەی بەشەکەیان چەند بووە، ڕووداوە گرنگەکان چی بوون کە لەو بەشەدا ڕوویان داوە.

تەواو ڕاستگۆ بە لە قسەکانتدا. دەکرێت قسەی ناڕاست جار جار تاکە کەسێك لەخشتە ببات، لەلام هەرگیز کۆمەڵێك بینەر و گوێگر فریو نادات. "ئێوە زۆر زیرەکن..." "ئەم کۆبوونەوە جوان و پیاوانەیە لەم شارەدا شتێکی زۆر دەگمەنە..." "زۆر خۆشحاڵم کە لێرەم، چونکە هەست بە خۆشەویستی ئێوە دەکەم." نا نا نا! ئەگەر ناتوانیت سوپاسی پێزانی ڕاستەقینە دەربڕیت، هیچ مەڵێ!

### سێیەم/ خۆت لە ئامادەبووان نزیك بکەرەوە

چەند زوو پێت دەکرێت، بەتایبەت لە قسەکانی سەرەتادا، باس لە خاڵی هاوبەشی نێوان خۆت و ئەو کەسانە بکە کە قسەیان بۆ دەکەیت. ئەگەر ڕێزیان لێگرتوویت بەوەی داوایان لێکردوویت قسە بکەیت، بیلێ. کاتێك هارۆڵد ماکمیلان، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، قسەی بۆ دەرچووانی زانکۆی 'دی پاو' دەکرد لە گرینکاسڵ - هیندستان، لە یەکەم قسەیدا بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

"زۆر سوپاستان دەکەم بۆ پێشوازیکردنم بە وشە شیرینەکانتان. بانگهێشتکردنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بۆ زانکۆکەتان بۆنەیەکی تایبەتی و جیاوازە. هەست دەکەم بەهۆی پێگە و پلەکەمەوە منتان بۆ ئێرە بانگهێشت نەکردووە.

ئەنجا دواتر ئاماژەی بەوە کرد کە دایکی ئەمریکییە و لە هیندستان لەدایك بووە، هەروەها باوکیشی یەکێکبوو لە دەرچووەکانی زانکۆی 'دی پاو.' وتی: دڵنیابن شانازی دەکەم بەوەی بەجۆرێك لە جۆرەکان پەوەندیم بە زانکۆکەتانەوە هەیە و توانیم بۆنەیەکی ئەم خێزانە کۆنە نوێ بکەمەوە."

دڵنیام باش لەوە تێدەگەیت ماکمیلان بەئاماژەپێکردنی ئەوەی کە دایکی لە هیندستان لەدایك بووە و باوکیشی یەکێك بووە لە پێشەنگەکانی ئەو زانکۆیە، بەزوویی هاوڕێ و ناسراوی بۆ خۆی پەیدا کردووە.

ڕێگایەکی دیکە بۆ ئەوەی دەست بە قسەکانت بکەیت بریتییە لە بەکارهێنانی ناوی ئەو کەسانەی لەناو ئامادەبووانداندا. جارێکیان لە کۆبوونەوەیەك کە لە هۆڵێکدا بوو هەمووان نانمان دەخوارد، منیش لە تەنیش یەکێك لەو کەسانەوە بووم کە بڕیار وابوو ووتار پێشکەش بکات. زۆر پێم سەیر بوو حەزی دەکرد هەموو ئەو کەسانە بناسێت کە لەسەر مێزەکانی دیکە دانیشتبوون. بەدرێژایی ئەو ماوەی نانمان دەخوارد هەر پرسیاری دەکرد، ئەو کەسە کێیە قاتێکی شینی لەبەردایە، ئەو خانمە ناوی چییە کڵاوێکی گوڵاوی بەسەرەوەیە. کاتێك هەستا قسە بکات، بەڕوونی تێگەیشتم بۆچی ئەوەی دەکرد. بەشێوەیەکی زۆر ژیرانە هەندێك

لەو ناوانەی لە چیرۆکێکدا هۆنییەوە کە لەبەری کردبوون، زۆر بەڕوونی هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد لە ڕووخساری ئەو کەسانەدا کە لەو چیرۆکەدا ناوەکانیان بەکارهاتبوو. تەنها بەهۆی ئەو تەکنیکە سادەوە ئامادەبووان زۆر بەگەرموگوڕی و مەراقەوە گوێیان ڕاگرتبوو.

ئاگاداری شتێك بە: ئەگەر ویستت هەندێك ناوی نوێ بەکار بهێنیت، دڵنیابە لەوەی ناوەکانت گونجاون، بزانە بۆ ئەو ناوانە بەکار دەهێنیت، هەوڵ بدە بەشێوەیەکی گونجاو بەکاریان بهێنیت، وە لە بەکارهێنانیاندا میانڕەو بە.

ڕێگایەکی دیکە بۆ ئەوەی ئامادەبووان لە لوتکەی وریایی و گوێگرتندا ڕابگریت ئەوەیە کە لەبری "ئەوان" جێناوی "تۆ" بەکار بهێنیت، بەم ڕێگەیە ئامادەبووانت بەئاگا دەهێنیتەوە. وەك ئەوەی پێشتریش ئاماژەم پێدا گەر قسەکەر بیەوێت سەرنج و بیر و هۆشی گوێگرەکانی لای خۆی ڕاگرێت، نابێت ئەم ڕێگەیە فەرامۆش بکات.

بەڵام هەندێك کات بەکارهێنانی ڕاناوی "تۆ" مەترسیدارە، ڕەنگە لەبری پردی پێکەوەبەستن، کەلێنێك لە نێوان قسەکەر و ئامادەبووانداا دروست بکات. ئەمەش ئەو کاتە ڕوودەدات کە بەشێوەیەك قسە بکەین کە لۆمە و سەرزەنش لە قسەکانماندا دیار بێت یان هەوڵ بدەین ئامۆژگاری گوێگر بکەین. لەك کاتەدا باشتر وایە لەبری ڕاناوی "تۆ" ڕاناوی "ئێمە یان من" بەکار بهێنین.

دکتۆر باوەر، بەڕێوبەری تەندروستیی لە دامەزراوەی پزیشکی ئەمریکا، هەموو کاتێك لە وتارەکانیدا ئەو تەکنیکەی بەکاردەهێنا. لە یەکێك لە قسەکانیدا وتی، "ئێمە هەمووومان دەمانەوێت بزانین چۆن پزیشکێکی

باش هەڵبژێرین، ئەی وا نییە؟ ئەی ئەگەر بمانەوێت پزیشکەکەمان باشترین خزمەتمان بکات، ئایا هەموومان نابێت فێری ئەوە بین چۆن ببینە نەخۆشێکی باش؟"

## چوارەم/ گوێگرەکانت بکە بە بەشێك لە قسەکانت

ئایا هیچ کاتێك ئەوە هاتووە بە خەیاڵتدا کە بتوانیت بە بەکارهێنانی کەمێك کارامەیی سەرنجی گوێگرەکانت بۆ یەکە بە یەکەی وشەکانت ڕاکێشیت؟ ئەو کاتەی هەندێك لە گوێگرەکانت هەڵدەبژێریت و وەك نموونە بەکاریان دەهێنیت تاوەکوو مەبەستەکەت ڕوون بکەیتەوە، گوێگر زیاتر بایەخ بە قسەکانت دەدەن و سەرنجیان لات دەبێت. کاتێك ئامادەبوو دەبینێت خۆی بووە بە بەشێك لە بابەتەکە، یان کاتێك قسەکەر ناوی یەکێکیان دەهێنێت، زۆر بەپەرۆشەوە گوێدەگرن بزانن دواتر چی دەبێت و چی ڕوودەدات. وەك زۆرێك لە ووتاربێژان دەڵێن: وای دابنێ دیوارێك هەبێت لەنێوان ئەو کەسەی لەسەر دوانگە قسەدەکات و ئەو کەسانەی دانیشتوون گوێیان گرتووە، بۆ ئەوەی ئەو دیوارە بشکێنیت پێویستە لە قسەکانتدا بەشداری بە گوێگرەکانت بکەیت. لەبیرمە جارێکیان قسەکەرێك باسی ئەو دووریەی دەکرد کە ئۆتۆمبێل لەکاتی ئیستۆپگرتندا پێویستییەتی تا دەوەستێتەوە. داوای لە یەکێك لە ئامادەبووان کرد کە لە پێشەوە دانیشتبوو، هەستێتە سەر پێ و هاوکاری بکات باسی ئەوە بکەن چۆن بەپێی خێرایی ئۆتۆمبیلەکە ماوەکەش دەگۆڕێت. پیاوەکە سەری مەترەکەی گرت و ٤٥ پێ ڕۆشت بەولاوە، ئەنجا بە ئاماژەی کابرای قسەکەر وەستا. کاتێك تەماشای ئەو دیمەنەم

کرد هیچم پێ نەکرا، سەرسام بووبووم لەوەی هەموو ئامادەبوون واقڕماو و ئەبڵەق بووبوون بەدیار ئەو ووتارەوە. بە خۆمم گووت بەدڵنیاییەوە ئەو مەترە بەتەنها هێڵی پەیوەندی نێوان ووتاربێژ و گوێگرەکانی بوو. بەبێ بەکارهێنانی ئەو تەکنیکە سادەیە ڕەنگە ئامادەبووان هەر دڵیان لای ئەوە بووایە ئاخۆ بۆ ئێوارە چییان هەبێت بیخۆن، یان تۆ بڵێی ئەم ئێوارەیە لە تەلەڤزیۆنەوە چی بەرنامەیەکی خۆش بکات.

یەکێك لە ڕێگاکان بۆ تێکەڵکردنی گوێگر بە بابەتەکەت ئەوەیە کە پرسیار بکەیت و وەڵامەکانیش وەرگریت. من ئەم ڕێگایەم زۆر بەلاوە پەسەندە، حەز دەکەم گوێگر هەستێتە سەر پێ، لەدوامەوە ڕستەیەك بڵێتەوە، یان بە بەرزکردنەوەی دەستیان وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە. کتێبەکەی پێرسی وایتینگ بەناوی (*چۆن گاڵتە وگەپ تێکەڵ بە قسە و نوسینەکانت بکەیت*) هەندێك ئامۆژگاری و ڕێنمایی بەنرخی تێدایە کە تابەتن بەوەوە چۆن گوێگر بهێنیتە ناو باسەکانتەوە و پەشدارییان پێ بکەیت، بۆ ئەم مەبەستەش پێشنیاری ئەوە دەکات داوا بکەیت گوێگرەکانت لەسەر بابەتێك دەنگ بدەن، یان داوایان لێ بکە کێشەیەکت بۆ چارەسەر بکەن.

## پێنجەم/ خۆت بە کەم بزانە ـ خاکیی بە

هیچ شتێك شوێنی ئەو دڵسۆزی و ڕاستگۆییە ناگرێتەوە کە لە نێوان قسەکەر و گوێگردا هەیە. جارێکیان نۆرمان ڤینسنت هەندێك ئامۆژگاری زۆر بەسوودی وەزیرێکی هاوڕێی کرد کە کێشەی ئەوەبوو نەیدەتوانی لە ووتارەکانیدا ئامادەبووان ڕابگرێت و سەرنجیان ڕاکێشێت. داوای لە

وەزیرەکەی هاوڕێی کرد پرسیار لەبارەی ئەو ووتارانەوە بکات کە هەموو ڕۆژی شەممەیەك پێشکەشیان دەکات ـ ئایا حەزی لەو قسانە هەیە، ئایا دەیەوێت هاوکاری گوێگرەکانی بکات، ئایا خۆی بە کەمتر دەزانێت لە گوێگرەکانی؟ دکتۆر نۆرمان باسی لە خۆی کرد و وتی: هیچ کاتێك نەبووە بچێتە سەر دوانگە و هەستێکی بەهێزی خۆشەویستی بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە قسەیان بۆ دەکات. گوێگر زۆر بەخێرایی هەست بەو ووتاربێژە یان ئەو قسەکەرە دەکات کە پێی وایە لەڕووی ژیرییەوە لە گوێگرەکانی باشترە یان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە پێگەیەکی بەرزتری هەیە. بەڕاستی یەکێك لە باشترین ڕێگاکان بۆ ئەوەی ووتاربێژ لای گوێگر و بینەرەکانی خۆی خۆشەویست بکات ئەوەیە کە خۆی بە کەم بزانێت.

ئادلەی ئێوین ستیڤنسن، پارێزگاری ئەوکاتەی ویلایەتی میشیگان، کاتێك لە دەستپێکی کردنەوەی دەوامدا لە زانکۆی میشیگان ووتارێکی پێشکەش کرد، زۆر سادە و خاکی قسەکانی دەکرد، بەمشێوەیە وتی: "بەڕاستی من خۆم بەشیاو نازانم لێرەدا قسە بکەم، هەر لەبەر ئەمەیە وتە بەناوبانگەکەی ساموێل بەتلەرم بەبیر هیاتەوە. کاتێك پرسیاریان لێکرد چۆن بتوانین لەگەڵ بارودۆخە سەختەکانی ژیاندا خۆمان بگونجێنین. بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: 'من تەنانەت نازانم چۆن لەگەڵ ١٥ خولەکی داهاتوودا خۆم بگونجێنم.' منیش وا هەست دەکەم وەك ئەوم لێهاتووە و نازانم لەم ٢٠ خوولەکەی پێتان داوم چۆن خۆم بگونجێنم. "

باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەت (گوێگر، بینەر، یان بیسەر) بکەیت بە دوژمنی خۆت ئەوەیە کە وا خۆت پیشان بدەیت تۆ لەسەرو ئەوانەوەی. کاتێك قسە دەکەیت، وەك ئەوە وایە لە پێشانگایەکدا بیت و

هەموو ڕوویەکی کەسایەتیت پیشان بدرێت. بچووکترین فشە و خۆهەڵکێشان کارەسات دروست دەکات. لەلایەکی دیکەوە، خۆبەکەمزانی (تواضع) دەبێتە هۆی دروستبوونی متمانەبەخۆبوون و ئیرادەی بەهێز.

هێنری و دانا لی تۆماس، لە کتێبەکەیاندا بەناوی *ژیاننامەی سەرکردە ئاینییەکان*، بەم شێوەیە باسی کۆنفۆشی دەکەن: "هەرگیز هەوڵی نەداوە بە زانیارییە *تایبەتییەکانی* خەڵکی سەرسام بکات. تەنها هەوڵی داوە بە دڵسۆزییەکی گشتییەوە بابەتەکەیان بۆ ڕوون بکاتەوە." ئەگەر ئێمەش ئەو دڵسۆزییەمان هەبێت، ئەو کلیلەمان دەست دەکەوێت کە دەرگای دڵی گوێگر و بینەرەکانمان بۆ دەکاتەوە.

**پوختەی بەندی دووەم**

**قسە، قسەکەر، و کوێگر**

**بەشی چوارەم: کارامەبوون و بەدەستهێنانی توانای قسەکردن**

یەکەم/ بابەتەکەت سنوردار بکە

دووەم/ گەشە بە توانا شاراوەکانت بدە

سێیەم/ قسەکانت پڕ بکە لە ڕوونکردنەوە و نموونە

مرۆڤ بکە بە نموونە لە چیرۆکەکەتدا

بە بەکارهێنانی ناو، قسەکانت تایبەت بکە بە کەسێکەوە

قسەکانت پڕ بکە لە زانیاری دەقیق

قسەکانت بکە بە دراما ـ ئاخاوتنی کەسانی دیکە بەکار بهێنە

ئەوەی باسی دەکەیت بیهێنە پێش چاوی گوێگر

چوارەم/ وشەگەلێکی بەرجەستە بەکار بهێنە کە وێنای بابەتەکەت بکات

**بەشی پێنجەم: قسەکانت ببوژێنەوە**

یەکەم/ بابەتێك هەڵبژێرە کە خۆت تامەزرۆی بیت

دووەم/ هەستەکانت لە بابەتەکەدا زیندوو بکەرەوە

سێیەم/ بە شێوەیەکی چوست و چالاك بجوڵێ

**بەشی شەشەم: با قسەکانت گوزارشبێت لە ژیانی گوێگرەکانت**

یەکەم/ باس لە حەزی گوێگرەکانت بکە

دووەم/ لە دڵەوە سوپاس و پێزانینی خۆت دەربڕە

سێیەم/ خۆت لە ئامادەبووان نزیك بکەرەوە

چوارەم/ گوێگرەکانت بکە بە بەشێك لە قسەکانت

پێنجەم/ خۆت بە کەم بزانە ـ خاکیی بە

# بەنـدی سێیـەم



## مەبەست لە وتاری ئامادەکراو و وتاری ئامادەنەکراو

ئێستا کاتی ئەوەیە بەوردی باس لە دوو شێوازی ووتاردان بکەین، شێوازی ئامادەکر و ئامادەنەکراو.

ئەم سێ بەشەی دواتر تەرخان کراون بۆ ئەو شێوازە ووتاردانەی کە ئامانج لێی قایلکردن، پێدانی زانیاری، و قەناعەت پێکردنی گوێگر و بینەرە.

بەشێکیان باس لە ووتارێکی لەپڕ و سەرپێیی دەکات کە دەکرێت ببێتە ووتارێکی قایلکەر، زانیاری بەخش، یان سەرنجڕاکێش.

هەریەك لە ووتاری ئامادەکرا و ووتاری کتوپڕ و ئامادەنەکراو دوو شێوازی بەسوود و سەرکەوتوون، بەو مەرجەی ووتاربێژ لە مێشکی خۆیدا بەڕوونی مەبەستی سەرەکی ووتارەکەی دەستنیشان کردبێت.

## ((بەشـی حەوتـەم))

## ئامادەکردنی وتاری کورت

## بۆ ئەوەی کارێك بە ئامادەبووان بکەیت

---

لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، قەشەیەکی ئینگلیزی بەناوبانگ لە کەمپێکی سەربازیدا قسەی بۆ سەربازان دەکرد. ئەم سەربازانە خەریکی خۆئامادەکردن بوون و بەرەو کەندەڵان و دۆڵ و ناوچە سەختەکان بەڕێدەکەوتن: تەنها کەمێکیان دەیانزانی بۆچی دەیاننێرن بۆ ئەو شوێنە، ئەوەکانی دیکە هەر نەیاندەزانی چی چاوەڕێیان دەکات و چی دەگوزەرێت. لەگەڵ ئەوەشدا کابرای قەشە باسی "هاوپەیمانی نێودەوڵەتی" و "مافەکانی سڕبیا"ی بۆ ئەو سەربازانە دەکرد. ئاخر بۆ! نیوەیان نەیاندەزانی سڕبیا شارە یان ناوی نەخۆشییە. ڕەنگە ئەو کابرا ڕاپۆرتێکیشی لەبەرکردێت و باسی ئەستێرەکانیشی بۆ کردبن. بەڵام ئەوەی سەیر بوو لەگەڵ ئەوەشدا یەك سەرباز هۆڵەکەی بەجێ نەهێشت. ئاخر دەرگای چوونەدەرەوە بە پۆلیس گیرابوو بۆ ئەوەی کەس ڕانەکاتە دەرەوە!

من بەکەم تەماشای ئەو قەشە ناکەم، ئەو کەسێکی تەواو پسپۆڕ بوو، ئەگەر لەبەرانبەر هەندێك پیاوی ئایینیدا قسەی بکردایە زۆر کاریگەر و بەهێز دەبوو: بەڵام لەگەڵ ئەو سەربازانەدا هیچی پێ نەکرا، قسەکانی هیچ سوودیان نەبوو. لەبەر چی؟ چونکە نە دەیزانی مەبەستی قسەکانی چییە، نە دەیزانی چۆن قسەکانی بگەیەنێت.

ئایا مەبەست چییە لە 'ئامانجەکانی ووتاردان؟' مەبەستمان ئەمەیە: ووتاربێژ خۆی بزانێت یان نەزانێت، هەموو قسەیەك (ووتارێك) یەکێك لە چوار ئامانجە سەرەکییەی هەیە. ئەی ئایا ئەو ئامانجانە چین؟

١. بۆ ئەوەی بەرانبەر قایل بکەیت کارێکت بۆ بکات.

٢. بۆ ئەوەی زانیاری پیێ بدەیت.

٣. بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر دروست بکەیت و قەناعەتی پیێ بێنیت.

٤. بۆ خۆشحاڵکردنی بەرانبەر.

ئێستا با هەر یەك لەم ئامانجانە بەچەند نموونەیەکی ئیبراهیم لینکن (یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەمریکا) ڕوون بکەینەوە.

یەکەم، کەم کەس ئەوە دەزانێك لینکن کاتی خۆی ئامێرێکی درووست کرد بۆ دەرهێنانی ئەو بەلەمانە بەکاردەهێنرا کە لەناو لمە کەڵەکەبووەکانی دەریادا دەچەقین. لە دوکانێکی میکانیکی نزیك ئۆفیسەکەی خۆی کاری دەکرد و سەرقاڵی دروستکردنی ئامێرێکی تایبەت بە خۆی بوو. کاتێك هاوڕێکانی دەهاتن بۆ دووکانەکەی بۆ ئەوەی ئەو ئامێرە ببینن، بێزار نەدەبوو لە ڕونکردنەوە و باسکردنی. مەبەستی سەرەکی ئەو ڕوونکردنەوانەشی ئەوەبوو زانیارییان پیێ بدات. ئەمە پێی دەوترێت قسەکردن بەمەبەستی پێدانی زانیاری.

دووەم، کاتێك لە گێتیسبێرگ (ئەو شوێنەی کە جەنگێکی گەورەی تێدا ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر قوربانی لێکەوتەوە) ووتارە بەناوبانگەکەی پێشکەش کرد، کاتێکیش لە دەستپێکی ڕێوڕەسمێکی چەندرۆژەدا یەکەم و دووەم ووتاری پێشکەش کرد، هەروەها ئەو کاتەی هێنری کلای مرد و لینکن ووتارێکی پێشکەش کرد لەسەر ژیاننامەی ـ لە هەموو ئەو سیێ

بۆنەدا، مەبەستی سەرەکی لینکن ڕاکێشانی سەرنجی ئامادەبووان و قەناعەتپێکردنیان بوو.

سێیەم، کاتێك قسەی بۆ بریندارانی جەنگ کرد، هەوڵی دا چەند بڕیارێکی گرنگ دەربکات. لە ووتارە سیاسییەکاندا، هەوڵی دەدا دەنگ بەدەست بهێنێت. مەبەستی سەرەکی هەموو ووتارەکانی ئەنجامدانی کارێك بوو لەلایەن گوێگرەکانییەوە.

چوارەم، دوو ساڵ پێش ئەوەی وەك سەرۆك هەڵبژێردرێت، لینکن لەسەر داهێنان ووتارێکی ئامادەکردبوو. ئامانجی ئەو وتارەش خۆشی و کات بەسەربردن بوو. بەلایەنی کەمەوە ئەوە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ئامانج: بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لە بەدەستهێنانیدا. لەڕاستیدا پیشەکەی – وەك ووتاربێژێکی بەناوبانگ – مایەی ناڕەحەتی و بێتاقەتی زۆر بوو بۆی. کێشە و دەردی سەری زۆری بۆ نابوویەوە. جارێك لە شارێکدا قسەی کردبوو یەك کەس نەهاتبوو گوێی لێ بگرێت.

بەڵام لە ووتارەکانی دیکەیدا بەشێوەیەکی بەرچاو سەرکەوتوو بوو، هەندێکیان بوون بە بەشێك لە ئەدەبیات و قسەی باوی ناو خەڵك. لەبەر چی؟ زۆربەی لەبەر ئەوە بوو لەو ووتارەکانیدا ئامانجەکەی لێ دیاربوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزان چۆن ئەو ئامانجەی بەدەست بهێنێت.

لەبەر ئەوەی زۆرێك لە ووتاربێژان ناتوانن ئامانجەکەیان لەگەڵ ئامانجی ئەو کۆبوونەوەدا یەك بخەن کە بڕیار وایە ووتاری تێدا بدەن، زۆربەی کات تێکەڵوپێکەڵ قسەکانیان دەکەن و تووشی ناڕەحەتی و خەفەت خوارد دەبن. بە نموونە: جارێکیان کۆنگرێسمانێکی ئەمریکا لە نیویۆرك بە فیکە و قوولە و هات و هاوار ناچار کرا ستەیج بەجێ بهێڵێت،

لەبەر ئەوەی هەرچەندە بابەتێکی پڕ زانیاری هەڵبژاردبوو قسەی لەسەر بکات، بەڵام کارەکەی بەبێ ئاگایی و ناژیرانە کردبوو. کاتێك خەڵکەکە گوێیان لێ گرتبوو، حەزیان لە قسەکانی نەبوو چونکە وەك ئامۆژگاری قسەی بۆ دەکردن و بە زانیاری و بابەتی جددی ڕێنمایی دەکردن، بێگومان گوێگریش حەزی لەمە نییە. ئامادەبوان حەزیان دەکرد کەمێك خۆشحاڵ بن و کەشێکی لەباریان هەبێت و تۆزێك کات بەسەر ببەن. ئەوەبوو سەرەتا بەئارامی و بەڕێزەوە گوێیان بۆ کابرای کۆنگرێسمان گرت، دە خوولەك ڕۆشت، چارەکێك ڕۆشت، هەمووان بەو هیوایە بوون بەزوویی ووتارەکەی تەواو بکات، بەڵام هەر تەواو نەبوو. هەر دەهات و هەر دەچوو: ئامادەبووان ئارامیان لێ بڕا، چیتر بەرگەی لەوە زیاتریان نەگرت. کەسێك قوولەیەکی کر، ئەوانیش بەدوایدا. لەماوەی یەك خولەکدا، بە هەزاران کەس هاوار و فیکەیان دەکر. کابرا ــ وەك چۆن نەیتوانی هەست بە تووڕەیی گوێگرەکانی بکات ــ نەیدەتوانی لە قسەکانیشی بەردەوام بێت. هەموویان گەرم بووبوون، دەتگووت جەنگ هەڵگیرساوە، ئارامییان لێ بڕابوو. زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی بێدەنگی بکەن. تا بێت گەردەلوولی تووڕەییان زیاتر دەبوو و دەنگیان بەرزتر و بەرزتر دەبوویەوە. لەکۆتاییدا، نەڕە و نرکەی ئامادەبووان و تووڕەیی و ناڕەزاییەکانیان ووشەکانی ئەمیان ونکرد ــ لەدووری ٤ مەترەوە گوێت لە دەنگی نەبوو. بۆیە ناچار وازی هینا، دۆڕانی خۆی ڕاگەیاند، بەزەلیلی و زەبوونی گەڕایەوە شوێنی خۆی.

سوود لەو نموونەیە وەربگرە. با مەبەست و ئامانجەکەت لەگەڵ ئامادەبووان وخوودی بۆنەکەدا بگونجێت. ئەگەر ئەو کۆنگرێسمانە

پێشوەخت ئامانجی قسەکانی دیاری بکردایە و بیزانیایە لەگەڵ ئەو ئامانجەدا یەکدەگرێتەوە کە ئەوان بۆی هاتوون، تووشی ئەو کارەساتە نەدەبوویەوە. دوای ئەوەی شیکاریت بۆ گوێگر و خوودی بۆنەکە (مناسەبەکە) کرد، ئەوکات یەکێك لەو چوار ئامانجە سەرەکییەکە هەڵبژێرە کە بۆنە و گوێگرەکان پێکەوە گرێ بدات.

لەم بەشەدا باسی چۆنییەتی ئامادەکردنی ووتاری کورت دەکەین بۆ ئەوەی ڕێبەرییەکت پێببێت، لەگەڵ ئەوەشدا بتوانیت ووتارەکانت داڕێژیت و ئامادەیان بکەیت. سێ بەشی دواتریش تایبەتن بە ئامانجە سەرەکییەکانی دیکەی ووتادان: ڕازیکردنی گوێگر بۆ ئەوەی کارێك بکات، پێدانی زانیاری، کارتێکردن و قایلکردن، هەروەها بە خۆشی و کات بەسەربردن. هەر یەکێك لەو مەبەستانە پێویستی بە شێواز و ڕێکخستنێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەریەکەیان کۆسپ و بەربەستێکی تێدایە کە دەبێت چارەسەر بکرێن. سەرەتا با باس لە چۆنییەتی ڕێکخستن و ئامادەکردنی ئەو جۆرە ووتارانە بکەین کە مەبەست لێیان دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر گوێگر و وایان لێ بکەیت قسەکانت جێبەجێ بکەن.

ئایا هیچ ڕێگا و میتۆدێك هەیە بتوانین بەهۆیەوە هێز و توانا و بیرکردنەوەکانمان ڕێك بخەین و بتوانین گوێگر و بینەرەکانمان ئاڕاستە بکەین و وایان لێ بکەین شوێن قسەکانمان بکەون؟ یان شتەکە تەنها تاکتیکێکی بێبەرنامە و هەڕەمەکییە؟

لەبیرمە لە ساڵانی سییەکاندا ئەوکاتەی خولەکانم بە هەموو وڵاتدا بڵاوەیان کربوو، هەمان ئەم پرسیارەمان لەگەڵ هاوکارەکانمدا تاوتوێ

دەکرد. بەهۆی زۆری بەشداربووان و بچوکی قەبارەی پۆلەکانەوە تەنها دوو خولەکمان بە بەشداربووانی خوولەکە دەدا قسە بکەن. گەر قسەکەر ئامانجی پێدانی زانیاری بووایە یان بۆ ڕابواردن و چێژوەرگرتن قسەی بکردایە، ئەو دوو خولەکە ئاسایی بوو، هەرچەندە کاتەکەی کەم بوو بەڵام کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو، کەسەکە دەیتوانی پەیامەکەی بگەیەنێت، بەڵام کاتێك دەهاتە سەر ئەوەی قسەکان بۆ ئەوە بێت گوێگر ئاڕاستە بکیت و کارێکیان پێ بسپێریت، ئەوکات بابەتەکە بەجۆرێکی دیکە بوو. کاتێك بابەتەکە بوو بەوەی ووتارەکان بۆ ئەوە بێت هانی بەرانبەر بدرێت و ئاڕاستەی بکات بۆ ئەنجامدانی کارێك، هەستمان کرد نەدەکرا لەسەر سیستەمە کۆنەکەی پێشوو بەردەوام بین: پێشەکی باس بکەین، دواتر ناوەڕۆك، و ئەنجا دەرەنجامی بابەتەکە. لەو ماوە کەمەدا ئەو شێوازە کۆنە شتێکی ئەستەم بوو. پێوسیتمان بە شتێکی تازە و جیاواز بوو بۆ ئەوەی لە ماوەی دوو خولەکدا دەرەنجامی ئەو قسانەمان دەست بکەوێت کە بۆ ئاڕاستەکردن و هاندانی گوێگر و بینەر ئامادەکرابوو.

لە شارەکانی چیکاگۆ، لۆس ئەنجەلۆس و نیویۆرك کۆبوونەوەمان ساز کرد. بانگهێشتی هەموو ڕاهێنەرەکانمان کر، زۆرێکیان لە باشترین زانکۆکانی وڵات وانەیان دەگووتەوە. ئەوانی دیکە ئەو کەسانە بوون کە پێگەیەکی بازرگانی گەورەیان هەبوو. هەندێکیان لەبواری ڕاگەیاندندا دیار و بەناوبانگ بوون. هیوامان ئەوەبوو لەو هەمووە باگراوەند و مێشکە جیاواز و هەمەجۆرەوە، ڕێگایەك بۆ ڕێکخستن و ئامادەکردنی ووتار بدۆزینەوە، ڕێگەیەك کە کاریگەر و سەرکەوتوو بێت، ڕێگەیەك لەڕووی

دەروونی و لۆژیکییەوە کاریگەری لەسەر گوێگر دروست بکات و پاڵنەرێك بێت وایان لێ بکات دەستبەکار بن و بە ئاڕاستەی قسەکانت هەنگاو بنێن.

ئەنجامی کۆبوونەوەکەمان بریتیی بوو لە لەدایکبوونی شێوازێکی ئەفسانەیی و نوێ تایبەت بە داڕشتنەوەی ووتار. ئەوەبوو دەستمان کرد بە بەکارهێنانی ئەو شێوازە لە خوولەکانماندا و لەوەوبەدوا بەبەردەوامی بەکارمان دەهێنا. ئایا ئەو شێوازە ئەفسانەییە چییە؟ بەسادەیی بریتییە لە: کاتێك دەست دەکەیت بە قسەکانت، وردەکاری ئەو نموونەمان پێ بڵێ کە باسی دەکەیت، ڕووداوێك بێت ئەو پەیامە سەرەکییە ڕوون بکاتەوە کە دەتەوێت بە هەمووانی بگەیەنیت. دووەم، بە زمانێکی ڕوون مەبەستەکەت بڵێ، بەدیاریکراوی بە گوێگرەکانت بڵێ دەتەوێت چی بکەن: وە سێیەم خاڵ، هۆکارەکەت بڵێ، ئەمەش ئەو خاڵەیە کە بەگوێگرەکانت دەڵێیت ئەگەر ئەو کارە بکەن تۆ پێیان دەڵێیت، ئەوەیان دەستدەکەوێت و ئەو سوودەیان پێ دەگات. واتە بەم شێوەیە کورت دەبێتەوە: نموونە دەهێنیتەوە، ئامانج و مەبەستەکەت دەڵێیت، هۆکار و دەستکەوتی قسەکانت دەخەیتەڕوو. داوام وایە ئەم ڕێسایە لەبیر نەکەیت و لەگەڵم بیت بۆ ئەوەی گرنگی ئەم بابەتەت بۆ دەربکەوێت.

ئەم ڕێسایە بۆ هەموو کاتێك زۆر گونجاوە. ووتاربێژ و قسەکەران چیتر ناتوانن کاتێکی زۆر بە پێشەکییەی دوورودرێژەوە بەسەر ببەن. ئامادەبووان کەسانێکی سەرقاڵ و بێ دەرفەتن، بۆیە حەز دەکەن قسەکەر بە زمانێکی ڕاست و ڕەوان قسەکانی بکات. ئەم کەسانە بەو ڕۆژنامانە و تەلەفزیۆن و ڕیکلامانە ڕاهاتوون کە بەکورتی و پوختی قسەکانیان دەکەن و پەیامەکانیان دەگەیەنن. هەموو وشەیەك حساباتی

خـۆی هەیـە و هـیچ شـتێك بـەزیاد نـاڕوات. بەبـەکارهێنانی شـێوازی ئەفسانەیی دەتوانیت لەوە دڵنیابیتـەوە سـەرنجی گوێگر و بینـەر بـەلای خۆتدا ڕادەکێشـیت و تـەرکیزت لەسـەر مەبەسـتی سـەرەکی پەیامەکـەت دەمێنێتەوە. بە بـەکارهێنانی ئـەم شـێوازە بـەدوور دەبیـت لـەوەی هـەر لەســەرەتای قســەکانتدا کۆمــەڵێك ڕســتەی بیتــام و نــاخۆش بڵێیــت، لەوانەش: "کاتم نەبوو بەباشی ووتارەکەم ئامادە بکـەم،" یـان "چـاوەڕێی ئەوە نەبووم لەناو ئەو هەمووەدا تەنها من هەڵسێنن قسە بکەم." گوێگر و بینـەر حـەزیان لـە پۆزشـهێنانەوە و بیـانوو نییـە، ڕاسـت بێـت یـان هەڵبەستراو. ئەوان کرداریان دەوێت. لەم شێوازی ئەفسانەییدا، لە یەکەم وشەی دەستپێکەوە کردار پێشکەشی گوێگرەکانت دەکەیت نـەك قسـەی دووبارە.

ئەم شێوازە بۆ کورتە ووتار زۆر ناوازەیە، لەبەر ئەوەی کاتێك قسە دەکەیت سەرەتاکەی سەرنجڕاکێشە، ئەنجا بەشی دواتری قسەکانت پڕییەتی لە هەندێك شت کە گوێگر تامەزرۆی زانینیەتی. ئەم جۆرە ووتارە بەشێوەیەکە کە گوێگر بەوردی گوێ لەو چیرۆکەت دەگرێت، بەڵام تا دوای تێپەڕبوونی دوو سێ خولەك مەبەستی سەرەکی قسەکانت نازانێت. لە کۆتایی قسەکانتدا و کاتێك دەتەوێت مەبەستەکەت بڵێیت و داوا لە گوێگرەکانت بکەیت ئەو کارە بکەن، دەتوانیت ڕاستەوخۆ پەیامەکەت بگەیەنیت و سەرکەوتوو بیت تیایدا. واتە چۆن؟ بە نموونە، هیچ کەسێك نییە گەر بیەوێت گوێگرەکانی بۆ کارێکی خێرخوازی هان بدات، ڕاستەوخۆ بەم شێوەیە دەست پێ بکات: "بەڕێزان ئامادەبووانی هێژا، دەمەوێت هەمووتان یەکی پێنج دۆلار بدەن." دەبینیت هەمووی

بەرەو دەرگاکە ڕادەکات. بەڵام ئەگەر قسەکەر باسی سەردانێکی بکات کە بۆ نەخۆشخانەی منداڵان کردوویەتی، لەوێ منداڵێکی بچووکی بینیووە حاڵی زۆر خراپ بووە، لاواز و کەساس بووبوو، کەسوکارەکەی دۆش دامابوون مات و مەلول نەیاندەزانی چی بکەن، کە دەتبینین دڵت ژان دەیگرت، بەڕاستی ئەو منداڵە زۆر پێویستی بە هاوکاری ماددی بوو بۆ ئەوەی نەشتەرگەری بۆ بکرێت، بۆیە داوای هاوکاری لە ئێوە کردووە. ئەوکات دەبینیت بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو گوێگران بابەتەکەت بەهەند وەردەگرن. ئەمە نموونەی چیرۆکێکە وادەکات گوێگرەکانت ئامادەبن بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی داوایان لێ دەکەیت.

ئێستا سەرنج بدە چۆن لێلاند ستۆوی ئەم نموونە کە ڕووداوێکی ڕاستییە، بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی وا لە گوێگرەکانی بکات بەدەم ئەو بانگەوازەوە بچن و هاوکاری ئەو منداڵە بکەن:

هەموو کات نزا دەکەم جارێکی دیکە تووشی ئەو بارودۆخە نەبمەوە. ئایا دەکرێت شتێك هەبێت لەوە خەماویتر کە بارودۆخ ئەوەندە تێکبچێت مەرگی منداڵێك هێندەی بستەیەك بایەخی نەبێت؟ یاخوا هیچ کات تووشی ئەو ساتە پڕ لە خەم و ناسۆرە نەبیت، خەم و پەژارەیەك کە بۆ تەواوی ژیانت بە ئازارەکەیەوە بتلێیتەوە و لەیادت نەچێتەوە. ئەگەر گوێت لە دەنگە پڕ لە گریان و قورگە وشکەکانیان بووایە و ناسۆر و خەمی نێو چاوەکانیانت بینابا، بتبینیایە لەو ڕۆژەدا بۆمب وەك لێزمەی باران ئەو ناوچەی تەنیبوو... هەموو ئەوەی لەو کاتەدا پێم بوو تەنها قوتوویەك بستە بوو. کاتێك هەوڵمدا بیکەمەوە، پۆلێك منداڵی جل شڕ و ڕووخسار چڵکن بەتووندی منیان گرت. کۆمەڵێك دایك، کە منداڵە

ساواکانیان لەباوەشدابوو، پاڵ پاڵێنیان بوو هەوڵیان دەدا بگەن بە من. منداڵەکانیان بەرز دەکردەوە و بەرەو لای من درێژیان دەکردن. کە دەستیانم بینی، چیم بینی خوایە! ئەوەندە لاواز بوون وە ئەوەی کۆمەڵێك ئێسك بە پێستێك داپۆشرابێت. لەو کاتە ناسکەدا حسابم بۆ یەك بەیەکی ئەو بستانە دەکرد و هیم بەفیڕۆ نەدەدا.

ئەوەندە بەپەرۆش و شپرزە بوون خەریك بوو بمخەن. لەو کاتەدا جگە لە سەدان دەستی چڵکن و لاواز، هیچی دیکەم نەدەبینیی: دەستی تێدابوو دەپاڕایەوە، هەندێکیان توند گرتبوومی، هەندێکیان بەنائومێدییەکەوە لە دوورەوە بەرز بووبوونەوە. هەموویان کۆمەڵێك دەستی خنجیلانەی جوان بەڵام ناخ هەژێن بوون. بستەیەك بۆ ئەملا و دانەیەکی دیکە بۆ ئەولا. شەش بستە لە بەینی پەنجەکانمەوە کەوتنە خوارەوە، ئەوەندەم زانی کۆمەڵێك جەستەی وشکبووی لەڕ و لاواز کەوتن بەسەر پێمدا. بستەیەك بۆ ئەملا و دانەیەکی دیکە بۆ ئەولا. سەدان دەست درێژ بووبوون و دەپاڕانەوە، سەدان چاوی پڕ لە هیوا دەگەشانەوە. منیش لەوێدا وەستابووم و هیچم پێ نەدەکرا، قوتوویەکی شینی بەتاڵم بەدەستەوە بوو. . . بەڵێ، یاخوا هەرگیز شتی وا نەبینیت.

بەڵێ، دایکانیش بەهەمان شێوە دەکرێت شێوازی ئەفسانەیی بەکاربهێنن و منداڵەکانیان هان بدەن، منداڵانیش کاتێك داوای شتێك لە دایبابیان دەکەن، دەتوانن سوود لەو شێوازی ئەفسانەییە وەربگرن و بەو شێوەیە داواکانیان بکەن. دەتوانیت ئەم شێوازە خەماوییە وەك ئامرازێکی دەروونی بەکاری بهێنیت بۆ ئەوەی بۆچوون و بیرکردنەوەکانت بە دەوروبەرت بگەیەنیت.

تەنانەت لە ڕیکلامکردنیشدا، ڕۆژانە دەبینین ئەم شێوازی ئەفسانەییە بەکاردەهێنرێت. بەم دواییانە کۆمپانیای ئێڤەرێدی (کۆمپانیایەکی دروستکردنی پاتری'یە) بەهۆی ئەم شێوازە ئەفسوناوییەوە ڕێژەیەکی زۆر پاتری فرۆشت. لە قۆناغی یەکەمدا کە پێی دەوترێت باسکردنی نموونەیە قسەکەر باسی ئەزموونی کەسێکی کرد کە شەوێکی درەنگ لەناو ئۆتۆمبیلەکەیدا وەرگەڕابوو و گیری خواردبوو. دوای ئەوەی بەشێوەی هێڵکاری ڕووداوەکەی ڕوونکردەوە، بانگی قوربانییەکەی کرد خۆی چیرۆکەکە تەواو بکات و باسی ئەوە بکات چۆن لایتەکانی لەو کاتە سەختەدا نەکوژانەوە و هوکاری ڕزگاربوونی بوو، جۆری پاترییەکەش ئێڤەرێدی بوو. دواتر کابرای قسەکەر گەشت بە قۆناغی دووەم و سێیەم – وتنی مەبەستەکە و هۆکارەکەی: "پاتری ئێڤەرێدی بکڕن، لەبەر ئەوەی ڕەنگە ڕۆژێك تووشی هەمان بارودۆخ بنەوە." ئەو چیرۆکە ڕووداوێکی ڕاستی بوو لە کۆمپانیادا وەك ئەرشیف هەڵگیراوە. من نازانم کۆمپانیای ئێڤەرێدی بەهۆی ئەو ڕیکلامەوە چەندێك پاتری فرۆشت، بەڵام ئەوە دەزانم کە شێوازی ئەفسانەیی ڕێگایەکی زۆر بەهێزە بۆ باسکردنی ئەو شتەی دەتەوێت گوێگرەکانت بیکەن یان نەیکەن. ئێستا با هەر جارەی باسی یەکێك لە هەنگاوەکان بکەین باسکردنی نموونەیەك، وتنی ئامانجەکەت، لەکۆتاشدا هۆکارەکەی.

### یەکەم/نموونەیەك یان ڕووداوێکی ژیانت باس بکە

ئەمە ئەو بەشەی قسەکانتە کە زۆرترین کاتی پێویستە. لەم بەشەدا باسی ئەزموونێکی خۆت دەکەیت کە وانەیەکی فێرکردووی. دەروونناسان

دەڵێن ئێمەی مرۆڤ بە دوو ڕێگە فێردەبین: یەکەم، **یاسای ڕاهێنان**، کە تیایدا زنجیرەیە ڕووداوی هاوشێوە وامان لێدەکات ڕەفتارمان بگۆڕێت. دووەم، **یاسای کاریگەری**، دەکرێت یەك ڕووداو ئەوەندە سەلانجڕاکێش بێت وامان لێ بکات ڕەفتار و هەڵسوکەوتمان بگۆڕین. هەر یەکێك لە ئێمە ئەم جۆرە ئەزموونەمان هەبووە و ڕووداوێکی کاریگەر لە ژیانماندا ڕوویداوە. ڕەفتار و هەڵسوکەوتمان بەشێوەیەکی بەرچاو بەهۆی ئەو جۆرە ئەزموونانەوە گۆڕاون و کاریگەرییان لەسەرمان هەبووە. بۆیە بە دووبارە ڕێکخستنەوەیەکی ڕوون و ڕەوانی ئەو ئەزموونانە، دەتوانین جارێکی دیکە کاریگەری لەسەر ڕەفتاری کەسانی دیکەش دروست بکەین. دڵنیابە دەتوانین ئەوە بکەین و سەرکەوتووش بین، لەبەر ئەوەی خەڵکی چەندێك پەرچەکرداریان بۆ ڕووداوەکان دەبێت ئەوەندەش بۆ وشەکان. لە وتاردان و لە بەشی نموونە باسکردندا، دەبێت بەشێکی ئەو ئەزموونەت باسی دەکەیت و بەشێوەیەك دایڕێژیتەوە کە هەمان ئەو کاریگەرییە لەسەر گوێگر دروست بکات کە سەرەتا لەسەر خۆت دروستی کردبوو. ئەمەش بەوە دەبێت کە نموونەکەت ڕوون بێت، وردودرشت بێت، و لەشێوەی درامایەکی خەمناکدا باسی بکەیت، بەجۆرێك بەلای گوێگرەوە زۆر سەرنجڕاکێش و کاریگەر بێت. ئێستاش چەند پێشنیارێك دەخەینە ڕوو کە وا لە نموونەکەت دەکەن ڕوون، چڕوپڕ، وردودرشت و پڕواتا بێت.

### نموونەکەت لەسەر ئەزموونێکی تاکەکەسی خۆت دارێژە

ئەم جۆرە نموونەیە زۆر بەهێزە بەتایبەت ئەوکاتەی کە نموونەکەت کاریگەری لەسەر ژیانی خۆت هەبووە. ڕەنگە ئەو ڕووداوەی وەك نموونە

باسی دەکەیت چەن خولەکێك کەمتری خایاندبێت، بەڵام لەو کاتە کەمەدا وانەیەکی لەبیرنەکراو فێربووبیت. ماوەیەك لەمەپێش یەکێك لە بەشداربووانی خولەکەمان ڕووداوێکی زۆر ترسناکی باسکرد، باسی ئەوەی دەکرد کە بە بەلەمەکەی وەرگەڕاوە و هەوڵی ئەوەی دابوو بگات بە کەنار دەریاکە. دڵنیام لەکاتی باسکردنی ئەو ڕوداوەدا گوێگرەکان خۆیان خستبووە شوێنی ئەو پیاوە و لەگەڵ بابەتەکەدا تێکەڵ بووبوون. لەوکاتەدا پیاوەکە ئامۆژکاری ئەوەی کردن کە ئەگەر کەوتنە بارودۆخێکی لەو شێوەیەوە، بە بەلەمەکەوە خۆتان بگرن تا کەسێك دێت بە هاناتانەوە. بەو جۆرە هەمووان بەتەواوی ئەو ئامۆژگارییەیان وەرگرت، چونکە بەجۆرێك نموونەکە کاریگەری دروستکردبوو وەك ئەوەی بەسەر ئەواندا هاتبێت.

ئەو ئەزموون و ڕووداوەی کە بووەتە هۆی ئەوەی شتێکی لێوە فێرببیت و هیچ کاتیش بیرت ناچێت باشترین ئامڕازە بتوانیت بەهۆیەوە کاریگەری لەسەر گوێگرەکانت دروست بکەیت. بەو جۆرە ڕووداوانە دەتوانیت وایان لێ بکەیت ئەو شتە ئەنجام بدەن کە تۆ دەتەوێت ـ لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەو ڕووداوە بەسەر تۆدا هاتبێت، ئەوانیش وا بیردەکەنەوە ڕەنگە بەسەر ئەوانیشدا بێت، بۆیە باشتر وایە ئامۆژگارییەکانت بەهەند وەربگرن و ئەوەی تۆ دەیڵێیت بەگوێت بکەن.

## کە دەستت بە قسە کرد، وردەکاری نموونەکەت باس بکە

یەکێك لە هۆکارەکانی باسکردنی نموونە بۆ ئەوەیە سەرنجی هەمووان ڕابکێشیت. بەداخەوە هەندێ ووتاربێژ ناتوانن لە دەستپێکی قسەکانیاندا سەرنجی بەرانبەرەکەیان ڕابکێشن، لەبەر ئەوەی ئەو قسانەی دەیکەن هەمووی پۆزش هێنانەوە و لێدوانی دووبارەیە کە هیچ جێگەی بایەخی گوێگر نین. هەرگیز نەڵێیت، "لەڕاستیدا من ئەمە یەکەم جارمە قسە بۆ خەڵ بکەم و ڕانەهاتووم." دەزانم ئەوە دەستپێکێکی زۆر باوە بەڵام کارێکی هەڵەیە. باسی ئەوە مەکە بۆچی ئەو ناونیشانەت هەڵبژاردووە، پێویست ناکات بچیتە وردەکاری ئەو بابەتەوە، چونکە ئەو قسانەت لای گوێگرەکانت ئەوە دەگەیەنێت بەباشی ئامادە نیت.

ئەو تەکنیکەت لەیاد بێت کە بەناوبانگترین ڕۆژنامە و گۆڤارەکان پیادەی دەکەن: ڕاستەوخۆ بچۆرە ناو باسکردنی نموونەکەتەوە ودەستبەجێ سەرنجی هەمووان ڕابکێشە. ئەمانە هەندێك ڕستەی دەستپێکن کە سەرنجیان ڕاکێشاوم و تۆش دەتوانیت بەکاریان بهێنیت:

"لەساڵی ١٩٩٦، کاتێك بە ئاگا هاتمەوە دەبینم لە نەخۆشخانەم."

"دوێنێ لەکاتی خواردنی نانی بەیانیدا خێزانەکەم چاکەی ڕژاند و . . . "

"مانگی ڕابردوو بە شەقامێکدا شۆفێریم دەکرد، لەپڕ. . . " "خێرا دەرگای ژوورەکەم کرایەوە و . . . " "لە شوێنێك دانیشتبووین، لەپڕ کەسێك بەخێرایی بەرو ڕووم هات و . . . "

ئەگەر بەو ڕستانە دەست پێبکەیت کە وەڵامی پرسیارەکانی کێ؟ کەی؟ لەکوێ؟ چی؟ چۆن؟ بۆچی؟ دەداتەوە، ئەوە مانای وایە یەکێك لە باشترین ئامرازەکانی گفتوگۆکردن بەکاردەهێنیت. "ڕۆژێك لە ڕۆژان"

دەستەواژەیەکی ئەوەندە ئەفسوناوییە کە دەرگای خەیاڵاتەکان لە مێشکی منداڵدا دەکاتەوە. بەڵێ، بە بەکارهێنانی هەمان ئەو دەستەواژەیە دەتوانیت هەر لە سەرەتای قسەکانتەوە سەرنجی گوێگرەکانت بەلای خۆتدا ڕابکێشیت.

## نموونەکەت پڕ بکە لە باسی پەیوەندیدار

زانیاری بەتەنها سەرنجڕاکێش نییە. واتە چۆن؟ ژوورێکی پڕ لە کەلوپەل و خشڵ و شتی هەمەجۆر سەرنجڕاکێش نییە. وێنەیەك کە پڕیەتی لە شتی ناپەیوەست و بێسەروبەرە چاوی بینەر بەلای خۆیدا ڕاناکێشێت. بە هەمان شێوە، زانیاری زۆر - زانیاری ناپێویست و ناپەیوەست - گفتوگۆ و قسەکانت بێتام و بێزارکەر دەکات. گرنگی ئەم بابەتە لەوەدایە تەنها ئەو زانیاریانە هەڵبژێریت کە پاڵپشتی بۆچوونەکانت دەکەن. ئەگەر دەتەوێت ئەو بۆچوونە لای گوێگرەکانت بچەسپێنیت کە پێویستە پێش سەفەری دوورودرێژ ئۆتۆمبیلەکەیان بپشکنن، دەبێت تەواوی زانیاری و نموونەکەت باسی ئەوە بکات کاتێك گەشتت کرد و ئۆتۆمبیلەکەت نەپشکنیبوو، چیت بەسەر هات. ئەگەر دەتەوێت باسی ئەو شوێنە بکەیت کە بۆی ڕۆشتیت، پێویست ناکات باسی ڕێگاکە بکەیت، بەڵکوو باسی ئەوشوێنە و خۆشی و تایبەتمەندییەکانی بکە. بەو شێوەیە بەپێی مەبەستەکەت زانیارییەکانیشت بخەڕوو.

**دووەم/ ئامانجەکەت بڵێ، دەتەوێت گوێگر و بینەر چی بکەن**

بەشی یەکەمی قسەکانت کە نموونەت هێنایەوە سێ لەسەر چواری کاتەکەتی برد. وای دابنێ دوو خوولەکی دیکەت ماوە... ٢٠ چرکەی دیکەت ماوە بۆ ئەوەی باسی ئەو شتە بۆ گوێگر بکەیت کە دەتەوێت ئەنجامی بدەن و ئەو سوودانەیان پێ بڵێیت کە لە ئەنجامدانی ئەو شتەدا دەستیان دەکەوێت. کاتی ڕوونکردنەوە و وردەکاری تەواوبوو. ئێستا کاتی ئەوەیە ڕاستەوخۆ و ڕاستگۆیانە مەبەستەکەت بڵێیت. ئەم تەکنیکە پێچەوانەی ڕۆژنامەکانە. لەبری ئەوەی سەرەتا سەربابەتەکە بڵێیت، ڕووداو و هەواڵەکە باس دەکەیت، دواتر ناونیشانەکەت بە ئامادەبووان دەڵێیبت، ناونیشانەکەش ئەو شتەیە کە بە ئامادەبووان دەڵێیت ئەنجامی بدەن. ئەم قۆناغەش بەپێی سێ یاسا بەڕیوەدەچێت:

١. مەبەستەکەت کورت و پوخت بڵێ.

٢. مەبەستەکەت لەبەرچاوی گوێگر ئاسان بکە.

٣. بە باوەڕ و قەناعەتێکی بەهێزەوە مەبەستەکەت بڵێ.

**سێیەم/ باسی ئەو هۆکارە یان ئەو سوودە بکە کە دەکرێت گوێگر دەستی بکەوێت**

هەم دیسان پێویستە کورت و ئابووریانە بیت. لە قۆناغی باسکردنی هۆکارەکەتدا، ئەو پاڵنەرە یان ئەو پاداشتە بۆ گوێگرەکانت باس دەکەیت کە ئەگەر ئەوەی داوات لێکردوون ئەنجامی بدەن، بەدەستی دەهێنن.

## دڵنیابە هۆکارەکەت پەیوەستە بە نموونەکەتەوە

لە بابەتی ووتاربێژیدا زۆر شت لەبارەی هاندانەوە نووسراوە. ئەم بابەتە بابەتێکی زۆر گرنگ و بەسوودە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت بەرانبەرەکەی قایل بکات و وای لێ بکات کارێك ئەنجام بدات. لە ووتارە کورتەکاندا، کە لەم بەشەی دواتردا سەرنج دەخەینە سەری، هەموو ئەوەی دەبێت ئەنجامی بدەیت ئەوەیە بە یەك یان دوو ڕستە ئەو سوودە باس بکەیت کە گوێگرەکانت دەستیان دەکەوێت و دواتر دانیشیت. بەڵام زۆر گرنگە سەرنج بخەیتە سەر ئەو سوودەی کە لە کاتی باسکردنی نموونەکەدا ئاماژەت پێدا. پێشتر نموونەت هێنایەوە و ئەزموونێکی خۆتت باس کرد، بۆیە نابێت ئێستا ئاڕاستەی قسەکانت بگۆڕیت و دەرگا بەڕووی بابەتێکی دیکەدا واڵا بکەیت. ئەگەر پێشتر باسی ئەوەت کردووە بە کڕینی ئۆتۆمبیلێکی نیوداش - دەستی دوو لەڕووی ئابوورییەوە قازانجت کردووە، هەروەها هانی گوێگرەکانت دا ئۆتۆمبیلی نیوداش بکڕن، دەبێت باس لەو هۆکارەکەش بکەیت کە دەبێتە هۆی ئەوەی لەڕووی ئابوورییەوە ئەوانیش قازانج بکەن. نابێت لە نموونەکەت لابدەیت و باس لەوە بکەیت هەندێك ئۆتۆمبیلی دەستی دوو لەم ئۆتۆمبیلە مۆدێل بەرزانە جوانترن و باسی ستایل و شتی ناپەیوەست بکەیت. نموونەکەت بۆ ئەوەبوو لەڕووی ئابوورییەوە سوود وەرگرن نەوەك شتی دیکە.

## تەنها سەرنجت بخە سەر یەك هۆکار ، تەنها یەك دانە

زۆربەی فرۆشیاران هۆکارگەلێکت بۆ باس دەکەن بۆ ئەوەی بەرهەمەکەیان بکڕیت، بۆیە شتێکی زۆر ئاساییە کە چەند هۆکارێك باس بکەیت بۆ ئەوەی پاڵپشتی مەبەستەکەت بکەیت و هەمووشیان پەیوەندیدار بن بەو نموونەی باسی دەکەیت، بەڵام باشترین شت ئەوەیە یەك هۆکار یان یەك سوودی دیار و کاریگەر هەڵبژێریت و بابەتەکەت تایبەت بکەیت پێیەوە. دەبێت قسەکانی کۆتاییت هێندەی ناونیشانی ڕۆژنامەکان ڕوون و ڕەوان بن. ئەگەر بەوردی سەرنجی ڕیکلامە بازرگانییەکان بدەیت، دەبینیت هۆکاری قسە و ڕیکلامەکەت بەڕوونی بۆ دەردەکەوێت، زۆر بەئاسانی دەزانیت ئەو ڕیکلامە ۆ چییە و مەبەستی چییە. هیچ ڕیکلامێك هەوڵ نادات بانگەشە بۆ زیاتر لە یەك بەرهەم بکات. زۆر بەکەمی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان زیاتر لە هۆکارێك بۆ کڕینی ئەو بەرهەمە باس دەکەن. هەموویان تەنها یەك هۆکار بە کڕیار دەدەن کە بۆچی پێویستە ئەو کاڵایە بکڕێت. ڕەنگە ئەو کۆمپانیایە ڕیکلامەکەی لە ناوەندێکەوە بگوازێتەوە بۆ ناوەندێکی دیکە، بە نموونە لە ڕۆژنامەوە بۆ تەلەفزیۆن یان لە رتەلەفزیۆنەوە بۆ تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان، بەڵام بەدەگمەن ئەو کۆمپانیایە لە یەك ڕیکلامدا بانگەشە بۆ چەند شتێکی جیاواز دەکات.

ئەگەر لەمەودوا سەرنجی ڕیکلامەکان بدەیت چۆن بابەتەکەیان شیدەکەنەوە و بانگەشەی بۆ دەکەت، سەرسام دەبیت بەوەی چەندە بەجوانی شێوازی ئەفسانەیی بەکاردەهێنن تاوەکوو خەڵکی قایل بکەن.

چەند ڕێگایەکی دیکە هەیە بۆ ئەوەی نموونەی گونجاو لە ووتارەکانتدا بگێڕیتەوە، بە نموونە، نواندن و ئاماژە و جوڵە، بە پیشاندانی وێنە و دیمەنی جیاواز، بەراوردکردنی بابەتەکە بە شتێکی دیکەوە، یان باسکردن لە داتا و زانیارییەکان. ئەمانەت بەباشی لەبیر بێت چونکە بەدووروودرێژی لە بەشی سیانزەهەمدا ڕوون دەکرێنەوە، لەوێ باس لە ووتاری دووروودرێژ دەکەین. لەم بەشەدا زیاتر پابەند بووین بە ڕووداوە کەسییەکانەوە.

## ((بەشی هەشتەم))

## وتاردان بەمەبەستی پێدانی زانیاری

لەبەشی حەوتەمدا، فێری شێوازی ئامادەکردنی ووتاری کورت بوویت بۆ ئەوەی وا لە گوێگرەکانت بکەیت کارێکت بۆ ئەنجام بدەن یان شوێن پێشنیارەکانت بکەون. ئێستا دەمەوێت ئەو ڕێگایانەت پێ پیشان بدەم کە هاوکارت بن لەکاتی گەیاندنی زانیارییەکانتدا واتا و مەبەستەکەت ڕوون بێت و گوێگر بەساتایی تێبگات. ئێمە ڕۆژانە چەندین قسەی پڕ زانیاری دەکەین: شوێنەکان پیشانی خەڵکی دەدەین، ڕاپۆرت دەنووسین، ڕوونکردنەوە بۆ خەڵکی دەدەین. ڕۆژانە و هەفتانە لە هەموو شوێنێك جۆرە جیاوازەکانی قسە دەکرێت، پلەی یەکەم لە قسەکردندا ئەو قسانەیە کە بۆ قایلکردن و قەناعەتپێکردنی بەرانبەر دەکرێت، لەدوای ئەوە ئەو قسانەی کە بۆ پێدانی زانیاری بە بەرانبەر دەکرێت بە پلەی دووەم دێت. لەبیرت نەچێت زۆر گرنگە لە قسەکردندا ڕوون بیت. ئەون دی یەنگ، خاوەنی یەکێك لە گەورەترین کۆمپانیاکانی ئەمریکا، پاڵپشتی ئەوە دەکات دەبێت لە دونیای ئێستادا قسەکانمان ڕوون و ڕەوان بن، بەم شێوەیە دەڵێت:

کاتێك کەسێك پەرە بە تواناکانی دەدات و هەوڵ دەدات تا وای لێبێت کەسانی دیکە لێی تێبگەن، دەرگای سەرکەوتوویی قسەکانی بەڕووی خۆیدا والآ دەکات. بێگومان لە کۆمەڵگەی خۆماندا خەڵکی هەر لە سادەترین کۆبوونەوەی هاوڕێیانەی خۆیاندا پێویستییان لێك

تێگەیشتنە، بۆیە پێویستە یەکەم شت هەوڵ بدەن لەیەك تێبگەن. زمان هۆکاری سەرەکی گەیاندنی مەبەستەکانمانە، لەبەر ئەوە پێویستە فێربین بەشێوەیەکی کارامە بەکاری بهێنین نەك بەشێوەیەکی زبر و توند.

هەندێك پێشنیار لەم بەشەدا خراوەتەڕوو بۆ ئەوەی بتوانیت بەشێوەیەك زمانت بەکار بهێنیت کە گوێگر و بینەرەکانت بەڕوونی لێت تێبگەن. لودڤیگ ڤیتگەنیشتاین، فەیلەسوفی بەریتانی، دەڵێت: "هەرشتێك بتوانرێت بیری لێ بکرێتەوە، دەکرێت بەڕوونی بیری لێبکرێتەوە. هەرشتێك بتوانرێت بووترێت، دەکرێت بەڕوونی بووترێت."

**یەکەم/ بابەتەکەت سنوردار بکە بۆ ئەوەی ئەو کاتەی بۆت دانراوە بەشت بکات**

بە نموونە، گەر لەسەر یەکێتی کرێکاران قسەت کرد، هەوڵ مەدە بە سی یان پێنج خولەك پێمان بڵێیت ئەم پارتە بۆچی دروست بوو، شێواز و سیسەتی کارکردنیان چییە، کارە باشەکانیان و کارە خراپەکانیان کامانەن، چۆن کێشە پیشەسازییەکانیان چارەسەر کردووە. نا، نا، شتی وا نەکەیت، ئەگەر هەوڵ بێتو کارێکی لەو شێوەیە بکەیت، هیچ کەس بەڕوونی تێناگات چین گووت و باسی چیت کرد، لەو جۆرە قسانەدا گوێگر تێگەشتنێکی ڕوونی نییە. بابەتەکەت تەواو شێواو و سەرپێیی و گشتگیر دەبێت و سەر لە بەرانبەر دەشێوێنیت.

ئایا ژیرانەتر و ئاقڵانەتر نییە یەك لایەنی یەکێتی کرێکاران هەڵبژێریت، ئەنجا بەجوانی و بەتەواوی ڕوونی بکەیتەوە و سەرنجی ورد بخەیتە سەری؟ بێگوان بەڵێ. ئەو جۆرە قسەکردن و ووتارانە کاریگەرییەکی

تەواو بەجێ دەهێڵن. چونکە ڕوون و ئاشکرایە، گوێلێگرتنی خۆشە، بیرکەوتنەوەی ئاسانە.

تەنانەت ووتاربێژ و قسەکەرە بەئەزموونەکانیش کوشتەی دەستی ئەم هەڵەیەن. ڕەنگە بەهۆی ئەوەی لە چەندین بواردا بەتوانا و شارەزان، بکەونە هەڵەوە و چەندین بابەتی جیا جیا باس بکەن. پێویست ناکات تۆ وەك ئەوان بیت. سەرنجت لەسەر پەیامی سەرەکی قسەکانت بێت. ئەگەر دەتەوێت ڕوون و ڕەوان بیت، دەبێت هەموو کە پرسیارت کرد، کاتێك گوێگرەکانت بتوانن پێت بڵێن، "لێی تێدەگەم، دەزانم باسی چی دەکات!"

## دووەم/ بەڕیز بیرۆکەکانت ئامادە بکە

هەر بابەتێك دەتەوێت باسی لێوە بکەیت، بەشێوەیەکی لۆژیکی ڕیزیان بکە و دابەشیان بکە بۆ کات، شوێن، ناونیشان. بۆ نموونە لە ڕووی کاتەوە، دەتوانیت بابەتەکەت دابەش بکەیت بەسەر ڕابردوو، ئێستا، و داهاتوودا. یان دەتوانیت لە بەروارێکەوە دەست پێبکەیت و بەرەو پێش یان بۆ دواوە بگەڕێیتەوە و درێژ بە باسەکەت بدەیت. هەموو ووتار یان قسەیەك وەك قۆناغەکانی دروستکردنی بەرهەمێکی پیشەسازییە، دەبێت لە کەرەستەی خاوی بابەتەکەوە دەستپێبکات، دواتر بچێتە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی دیکە و بەردەوام بێت تا دەگاتە تەواوبوونی بەرهەمەکە. بێگومان چەندێك وردەکاریش باس دەکەیت، ئەوەیان پەیوەندی بەو کاتەوە هەیە کە لەبەردەستتە.

لەڕووی شوێنەوە، بەپێی هەندێك خاڵی جەوهەری بیرۆکەکانت ڕێك بخە و دواتر بە هەموو لایەکدا فراوانتری بکە، یان بەئاراستەیەکی دیاریکراودا برۆ: باکور، باشور، ڕۆژهەڵات، و ڕۆژاوا. بۆ وێنا، ئەگەر ویستت باس لە شاری سلێمانی بکەیت، دەتوانیت سەرنجی گوێگرەکانت بۆ لای سەرای ئازادی کە ناوەندی شارە ڕابکێشیت، ئەنجا بە هەموو ئاراستەیەکدا بڕۆیت و باس لە شوێنێکی دیاریکراوی ئەو شارە بکەیت. بە نموونە، ئەگەر ویستت باس لە ئۆتۆمبیلێك بکەیت، باشتریت شێواز بۆ باسکردنی ئەوەیە کە بەجیا باس لە پێکهاتەکانی بکەیت.

هەندێك بابەت لق و پۆپی دیکەی لێدەبێتەوە. ئەگەر بڕیار وابوو باس لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەیت، باشتر وایە شوێن هەمان تەکنیك بکەویت و دابەشی بکەیت بۆ وەزارەتەکان و یەك بە یەك ڕوونیان بکەیتەوە.

## سێیەم/ ژمارە بۆ هەر خاڵێك دابنێ کا باسی دەکەیت

یەکێك لە سادەترین ڕێگاکان بۆ ئەوەی قسەکانت لە مێشکی گوێگردا بەڕێکوپێکی بهێڵیتەوە ئەوەیە کە بەڕوونی ئاماژە بە خاڵ بکەیت و لە خاڵی یەکەمەوە بەرەو ئەوانی دیکە بەردەوام بیت.

دەتوانیت بەم شێوەیە ڕوون و ئاشکرا قسەکان بکەیت، "خاڵی یەکەم بریتییە لە. . ." کاتێك باست لەو خاڵەیان کرد، دەتوانی بەئاشکرا بڵێیت دەچیتە خاڵی دووەم. ئەنجا بەم شێوەیە تا کۆتایی بەردەوام بیت. دکتۆر ڕاڵف جۆنسن بەنچ، کاتێك یاریدەدەری سکرتێری گشتی نەتەوە

یەکگرتووەکان بوو، بەم شێوازە ڕاستەوخۆیە دەستی کرد بە پێشکەشکردنی ووتارێکی زۆر گرنگ:

"بڕیارم داوە ئەمشەو قسە لەسەر ئەم ناونیشانە بکەم، 'ئاڵنگارییەکانی تایبەت بە پەیوەندییەکانی مرۆڤ،' ئەویش لەبەر دوو هۆکار." بەم شێوەیە بەردەوام بوو خاڵی یەکەمی گووت، "یەکەم شت..." ئەنجا نەوەستا و وتی، "دووەم هۆکار..." بەدرێژایی قسەکانی زۆر بەڕوونی بە گوێگرەکانی دەگووت ئەو خاڵە و ئەو خاڵە باس دەکات، تا گەشت بە کۆتاییەکەی:

"ئێمە هیچ کات نابێت بڕوامان بە تواناکان شاراوەکانی مرۆڤ نەبێت."

کاتێك ئابووریزان، پاوڵ دوگلاس، لە کۆبوونەوەیەکی بازرگانیدا قسەی دەکرد، بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر و سەرنجڕاکێش هەمان ئەم ڕێگەی بەکاردەهێنا. بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

"ئامانجی سەرەکی بابەتەکەم ئەمەیە: خێراترین و کاریگەرترین ڕێگای کەمکردنەوەی ڕێژەی باج لەسەر ئەو کەسانەی داهاتیان کەمە."

بەردەوام بوو لە قسەکانی و دەیگووت، "بەتایبەتی. . ." زیاتر درێژەی پێدا، "لەوەش زیاتر. . ." "سەرباری ئەوەش. . ." ئەنجا ئەمەی گووت:

"سێ هۆکاری بنەڕەتیمان هەیە:. . . یەکەم. . . دووەم. . . سێیەم. . . لە کۆتاییدا، پێویستە ڕێژەی باج کەم بکەینەوە بۆ ئەوەی ڕێژەی فرۆش زیاد بکەین." ئا بەم شێوە ڕێکوپێکە لە یەکەم خاڵەوە تا کۆتایی توانی گوێگر بۆ خۆی ڕاکێشێت.

## چوارەم/ نامۆکان بەراورد بکە بە ئاشناکانەوە

هەندێ جار هەوڵ دەدەیت و خەریکیت مەبەستەکەت بگەیەنیت بەڵام تێکەڵوپێکەڵی دەکەیت. هەندێ جار شتەکە زۆر ڕوونە بەلای خۆتەوە بەڵام پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەی بەلای گوێگرەکانیشتەوە ڕوون بێتەوە. ئایا پێویستە چی بکەیت؟ ئەو شتەی باسی دەکەیت بەراوردی بکە بە شتێکەوە کە گوێگر لێی تێبگات: بڵێ ئەم شتە وەك ئەو شتە وایە، نارووونەکە وەك ڕوونەکە وایە.

وای دابنێ باسی یەکێك لە ماددە کیمیاییەکان دەکەیت ـ کاتالیست. ئەم ماددەیە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ماددەکانی دیکەدا بەبێ ئەوەی خۆی گۆڕانکاری بەسەردا بێت. ئەمە زۆر سادەیە، بەڵام ناکرێ ڕوونتر بیڵێیت؟ بێگومان دەکرێت. بڵێ ئەم ماددەیە وەك کوڕێك وایە لە حەوشەی قوتابخانەدا ڕاوڕاوێن دەکات، هەموو منداڵەکانی دیکە بێزار دەکات، قورنچکیان لێ دەگرێت، بۆکسیان لێ دەدات، بەڵام هیچ کەسێك دەست لە خۆی نادات. دەبینیت بەوشێوەیە تێدەگەن ماددەی کاتالیست چۆن دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ماددەکانی دیکەدا بەبێ ئەوەی خۆی گۆڕانکاری بەسەردا بێت.

## پێنجەم/ هۆکاری بینایی بەکار بهێنە

ئەو دەمارانەی کە لە چاوەکانەوە دەڕۆن بۆ مێشك چەند ئەوەندەی ئەو دەمارانە گەورەترن کە لە مێشکەوە دەڕۆن بۆ گوێیەکان، هەروەها زانست پێمان دەڵێت: ئێمەی مرۆڤ ٢٥ ئەوەندەی گوێیەکان گرنگی بە

چاوەکان دەدەین. پەندێکی یابانی دەڵێت، "یەك جار بینین بەچاوی خۆت لە سەد ڕوونکردنەوە باشترە."

لەبەر ئەوە ئەگەر حەز دەکەیت لە قسەکانتدا ڕوون بیت، وێنای مەبەستەکەت بکە، بیرۆکەکانت بهێنە بەرچاوی بەرانبەرەکەت. ئەمەش ئەو پلانە بوو کە جۆن پاتێرسن، دامەزرێنەری کۆمپانیایەکی زەبەلاح، هەموو کات بەکاری دەهێنا. لە نووسینی بابەتێك بۆ یەکێك لە ڕۆژنامەکان، جۆن پاتێرسن باسی ئەو شێواز و ڕێگاینەی کرد کە لەکاتی قسەکردنی بۆ کارمەندان و فرۆشیارانی کۆمپانیاکەدا بەکاری دەهێنێت:

بە بڕوای من کەس ناتوانێت بەتەنها پشت بە قسە ببەستێ و پەیامەکەی بگەیەنێت یان بتوانێت سەرنجی بەرانبەرەکەی ڕاکێشێت. بۆ ئەم مەبەستە شتێکی دیکەش پێویستە. هەرکاتێك کرا باشتر وایە بە وێنە پالشتی قسەکانت بکەیت و زیاتر ڕوونکردنەوە بدەیت. هێڵکاری زۆر لە وشە باشترە بۆ قەناعەتپێکردنی ئامادەبووان، هەروەها وێنەش لە هێڵکاری باشتر و کاریگەرترە. باشترین ووتار یان سیمینار ئەوەیە کە هەموو پارچەیەکی قسەکان بە وێنە ڕوون بکرێتەوە و وشەکان تەنها بۆ ئەوە بەکاربهێنرێن تاوەکوو وێنەکان ببەستنەوە بەیەکەوە. هەر لە سەرەتای پیشەی قسەکردن و ڕەفتارکردنم لەگەڵ خەڵکیدا لەوە تێگەیشتم یەك وێنە لە هەموو ئەو قسانە باشترە کە دەیانبێژم.

ئەگەر خشتە و هێلکاریت بەکارهێنا، هەوڵ بدە بەپێی پێویست گەورە بێت و ببینرێت. لەبیرت بێت زیاد لە پێویست شتێکی باش دووبارە مەکەرەوە: ڕاستە بەکارهێنانی وێنە و هێڵکاری شتێکی باشە بەڵام بەشێوەیەکی زۆر و یەك لەدوای یەك شتێکی بێزارکەر و ناخۆشە. ئەگەر

لەکاتی ووتارەکەت یان سیمینارەکەتدا هێڵکاری دەکێشیت، بەخێرایی و بەتوندی لەسەر تەختە سپییەکەی پشتت هێڵکارییەکەت بکێشە. گوێگر حەزی لەوە نییە کاتژمێرێك تەماشای تۆ بکات هێڵ و سەهم بکێشیت. سەردێڕ و دەستەواژەی کورت بەکار بهێنە: بە دەستنووسێکی گەورە بنووسە بۆ ئەوەی ئاسان بخوێنرێتەوە: کاتێکیش لەسەر تەختەکە هێڵ دەکێشیت یان دەنووسیت بەردەوام بە لە قسەکردن و مەوەستە، بەدەم قسەکردنەوە ئیشەکەت بکە، زوو زووش ڕوو بکەرەوە گوێگر و بینەرەکانت.

کاتێك بابەتەکەت پێشکەش دەکەیت، شوێن ئەم پێشنیار و ڕێنماییانە بکەوە، دەبینیت گوێگرەکانت خەیاڵ دەبن بە بابەتەکەتەوە:

١. تا ئەو کاتەی ئامادەی بەکاری بهێنیت، وێنەکەت دەرمەخە.

٢. وێنەیەکی ئەوەندە گەورە بەکار بهێنە کە لە دوای دواوە ببینرێت کەسێك وێنەیەك نەبینێت لێی تێناگات و هیچ فێر نابێت.

٣. نەکەی لەکاتی قسەکردندا وێنە پیشانی ئامادەبووان بدەیت.

٤. کاتێك وێنەیەك یان شتێك پیشان دەدەیت، ئەوەندە بەرزی بکەرەوە کە هەمووان بیبینن.

٥. لەبیرت بێت، یەك بابەتی جوڵاو (وەك ڤیدیۆ) لە ١٠ دانەی وەستاو باشترە. بۆیە ئەگەر کرا بەکاری بهێنە.

٦. کاتێك قسە دەکەیت تەماشای وێنەکەت مەکە ـ تۆ لەگەڵ گوێگرەکانتدا قسە دەکەیت نەك وێنەکەت.

٧. دوای تەواوبوونی پیشاندانی وێنە و بابەتەکان، ئەگەر کرا خێرا لاییە لەبەرچاو.

٨. ئەگەر ئەو شتەی بەکاری دەهێنیت ئامێرێك یان کەرەستەیەکی جیاوازە، لەکاتی قسەکردندا بیخە سەر مێزەکەی تەنیشتەوە و بە شتێك دایپۆشە. کاتێك قسە دەکەیت، بەشێوەیەك باسی بکە و ئاماژەی بۆ بکە کە ئامادەبووان تامەزرۆی بن – بەڵام پێیان مەڵێ شتەکە چییە. دواتر کە دەتەوێت ئاشکرای بکەیت، هەمووان بەپەرۆشن و چاوەڕوانن بزانن چییە.

بەکارهێنانی شتە بینراوەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە، دیارترین و باوترین ئەو کەرەستانەن کە پەیامەکەت ڕوونتر دەکەنەوە. یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەمریکا، وودرۆو ویڵسن، ئەوەی باس کردووە کە ڕوونی لە قسەکردندا لە ئەنجامی مەشق و ڕاهێنان و خۆڕێکخستنێکی پێشوەختەیە. بە ئامۆژگارییەکانی ویڵسن، کە باس لە مەبەست و پەیامێکی ڕوون دەکات، کۆتایی بەم بەشە دەهێنین:

باوکم پیاوێکی ژیر و ڕۆشنبیر بوو. هەموو کات باشترین مەشق و ڕاهێنانی پێکردووم. باوکم ئەوەی قەبوڵ نەدەکرد قسەکانی ناڕوون و ئاڵۆز بێت. لەو کاتەی دەستم کرد بە نووسین تا ئەو کاتەی باوکم وەفاتی کرد، کە تەمەنی ٨١ ساڵ بوو، هەموو نووسینەکانم کە بۆ ئەو نوسیبووم هەڵم گرتبوون.

کاتی خۆی باوکم بەدەنگی بەرز نووسینەکانمی پێ دەخوێندمەوە، ئەمەش زۆر ئازاری دەدام. جار جار دەیوەستاندم، "مەبەستت چییە لەوە؟" منیش پێم دەوت و زیاتر لەوەی سەر کاغەزەکەم بۆ ڕوون دەکردەوە و شتی زیادەم پێ دەگووت. "ئەی بۆچی ئەوەت نەگووت؟"

بەو شێوەیە بەردەوام دەبوو. باوکم  هەموو کات دەیگووت: "بە تاپڕ تەقە لە مەبەستەکەت نەکەیت و هەموو ناوچەکە بشێوێنی، تەنها بە تفەنگێك تەقە لەو شتە بکە دەتەوێت بیلێیت."

## ((بەشی نۆیەم))

# ووتاردان بەمەبەستی قایلکردنی گوێگر

---

جارێکیان هەندێك ژن و پیاو تووشی زریانێك بوونەوە. زریان و باوبۆرانی ڕاستەقینە نا، بەڵام شتێکی لەو شێوەیە. بەکورتی، زریانی پیاوێك کە ناوی مۆریس گۆڵدبلات بوو. ئێستاش یەکێك لەو کەسانەی تووشی زریانەکە بووە بەم شێوەیە خۆی ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکات:

لە چیکاگۆ لەدەوری مێزێکی نانخواردندا دانیشتبووین. هەموومان دەمانزانی ئەو پیاوە بە ووتاربێژێکی بەهێز بەناوبانگ بوو. کاتێك هەستایە سەرپێ قسە بکات، زۆر بەسەرنجەوە تەماشامان دەکرد. بەبێدەنگی دەستی کرد بە قسەکردن ـ کەسێکی جوانپۆش، پیاوێکی ڕووخۆش، تەمەنێکی مامناوەندی هەبوو ـــ سوپاسی کردین کە بانگهێشتمان کردووە. وتی دەمەوێت باسی شتێکی گرنگتان بۆ بکەم، بمبوورن کە بێزارتان دەکەم.

دواتر هەر ئەوەندەمان زانی وەك ئەوەی گێژەلوولکە هەڵیکردبێت، دەستی پێکرد و گەرم بوو. دەهاتە پێشەوە و چاوی دەبڕییە چاومان. دەنگیشی بەرز نەدەکردەوە، بەڵام لە بەرچاوی من دەتگووت بە ئاسنێك دەدان بە مەنجەڵێکدا.

وتی، "تەماشای دەوروبەرتتان بکەن. تەماشای یەکتر بکەن. ئایا دەزانن چەنێك لەوانەی لەم ژوورەدا دانیشتوون بە نەخۆشی شێرپەنجە دەمرێت؟

یەك لەسەر چواری ئەوانەی تەمەنتان لەسەروو ٤٥ ساڵەوەیە. بەڵێ، یەك لەسەر چوارتان!"

کەمێك وەستا و ڕووخساری گەشایەوە. ئەنجا وتی، "ئەوەی ئێستا گووتم ڕاستیەکی تاڵ و سەختە، بەڵام زۆر درێژە ناخایەنێت و بەو شێوەیە نامێنێتەوە. خەریکی ئەنجامدانی کارێکن لەو بارەیەوە. چارەسەری شێرپەنجە لەبەرەوپێشچووندایە و بەداوی هۆکارەکانی شێرپەنجەدا دەگەڕێن."

بەخەمبارییەوە تەماشای دەکردین، چاوی بەدەوری مێزەکەدا دەگێڕا. پرسی، "ئایا دەتانەوێت هاوکاری دۆزینەوەی ئەو چارەسەر بن؟" ئایا جگە لە "بەڵێ" هیچ وەڵامێکی دیکە هەیە! بەبڕوای من هیچ وەڵامێکی دیکە نەبوو تەنها "بەڵێ" نەبێت، دوای منیش هەموو ئەوانی دیکەش هەمان بیرکردنەوەی منیان هەبوو.

لە کەمتر لە خولەکێکدا، مۆریس گۆڵدبلات توانی هەموومان قایل بکات یەك بە یەکمانی ڕاکێشایە نێو بابەتەکەیەوە. لەو کەمپینە خێرخوازییەی بۆ تووشبووان شێرپەنجە ڕایگەیاندبوو، هەموومان لەگەڵی بووین.

لەهەر شوێنێکدا بێت، بەدەستهێنانی وەڵامێکی ئەرێنی لەلایەن گوێگرەوە ئامانجی هەر ووتاربێژ و قسەکەرێکە. بەڕێز مۆریس هۆکارێکی باشی بەدەستەوە بوو بۆ ئەوەی هەر یەکێك لە ئێمە بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. ساڵانی پێشوو خۆی و براکەی - ناتان - لە هیچەوە دەستیان بە کار کردبوو. بازرگانییەکیان دامەزراندبوو کە ساڵانە زیاتر لە ١٠٠ هەزار دۆلار قازانجیان دەکرد. دوای ڕەنج و ماندووبوون و زەحمەتێکی زۆر، لەکۆتاییدا سەرکەوتنێکی زۆر گەورە و بێ وێنەیان بەدەست هێنا. ئەنجا

دوای ماوەیەکی کورت لە نەخۆشی شێرپەنجە، ناتان وەفاتی کرد. لەدوای ئەوەوە، مۆریس گۆڵدبلات یەك ملیۆن دۆلاری بەخشی بە پرۆگرامی توێژینەوەی نەخۆشی شێرپەنجە لە زانکۆی چیکاگۆ، هەروەها لە پیشەکەیدا خانەنشین بوو، هەموو کاتەکانی خۆی تەرخانکرد بۆ هەمووان لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە و پێکەوە دژی شێرپەنجە بجەنگن. هەموو ئەم ڕاستیانە پێکەوە لەگەڵ کەسایەتی مۆریس خۆیدا بوونە هۆی ئەوەی بتوانێت قەناعەتمان پێ بکات. پەرۆشی، دڵسۆزی، و تامەزرۆیی وەك ئاگر لە ڕەفتار و قسەکانیدا دەگەشایەوە و توانی ئێمەش بخاتە ژێر کاریگەری ئەو هەستە بەهێزانەیەوە. هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی لەگەڵ قسەکەردا هاوڕابین، وەك هاوڕێ لێی بڕوانین، هەروەها بکەوینە ژێر کاریگەرییەوە و دەستبەکار بین و شوێن قسەکانی بکەوین.

**یەکەم/ متمانەبەخۆبوون بەدەست بهێنە بەشێوەیەك کە شایستەی بیت**

مارکۆس کوانتیلیان، نووسەر و پەروەرشیاری ڕۆمانی، بەم شێوەیە پەسنی (وەصفی) ووتاربێژ دەکات: "ووتابێژ پیاوێکی باشە کە لە قسەکردندا کارامەیە." مارکۆس زۆر بە گرنگییەوە باسی لە دڵسۆزی و کەسایەتیی ووتاربێژ دەکات. هەرچی لەم کتێبەدا گووتراوە و ئەوەشی دەگووترێت، هیچیان ناتوانن شوێنی ئەم خاڵە گرنگە بگرنەوە ـ دڵسۆزی و کەسایەتی قسەکەر. پیرپۆت مۆرگان دەڵێت کەسایەتی باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی متمانە بەدەست بهێنیت: هەروەها باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی متمانەبەخۆبوون بەدەست بهێنیت. ئەلێکزاندەر وولکۆت دەڵێت، "کاتێك

کەسێك بەدڵسۆزییەوە قسە دەکات، بەجۆرێك بەرگی ڕاستی دەکات بەبەری قسەکانیدا کە هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت بیکات."
بەتایبەت ئەوکاتەی مەبەستی قسەکانمان قایلکردنی بەرانبەرە، پێویستە بۆچوون و قسەکانمان پڕ بکەین لە هەستی دڵسۆزی و متمانەبەخۆبوون. پێش ئەوەی هەوڵ بدەین کەسێکی دیکە قایل بکەین پێویستە و دەبێت سەرەتا خۆمان بەو شتە قایلبین و بڕوامان پێی هەبێت.

**دووەم/ وەڵامی "بەڵێ" بەدەست بهێنە**

واڵتەر دیڵ سکۆتن سەرۆکی پێشووی زانکۆی نۆرس وێستێرن، دەڵێت، "هەر بیرۆکەیەك، چەمکێك، یان زانیارییەکی نوێ کە دەچێتە مێشکەوە حسابی ڕاستی بۆ دەکرێت، بەو مەرجەی بیرۆکەیەك یان شتێکی دیکەی پێچەوانەی بۆ دروست نەبێت." ئەمەش بەو مانایە دێت کارێك بکەیت گوێگرەکانت لەگەڵت هاوڕابن نەك دژایەتیت بکەن یان ڕایان بگۆڕن. هاوڕێی نزیکم پرۆفیسۆر هاری ئۆڤەرستریت بەشێوەیەکی زۆر ژیرانە لەڕووی دەروونییەوە ئەم بابەتەی ڕوونکردەوە:
ووتاربێژ و قسەکەری کارامە هەر لە سەرەتای قسەکانییەوە ژمارەیەکی زۆر وەڵامی **بەڵێ** بەدەست دەهێنێت. لایەنی دەروونی گوێگر کاتێك بە ئاڕاستەیەکی ئەرێنیدا دەڕوات، جوڵەکەی وەك جوڵەی تۆپی بلیار وایە. واتە کاتیچك کەسێك بەڵێ بۆ قسەکانت دەکات، وەك ئەو تۆپە ویە کە بە ئاڕاستەیەك لێی دەدەیت و بە هێزێکی زۆرەوە دەڕوات، گەر بتەوێت ئەو تۆپ لە ئاڕاستەکەی خۆی لار بکەیتەوە کەمێك هێزت پێویستە، بەڵام بۆ

ئەوەی بتوانیت ئارستەکەی پێیەوانە بکەیتەوە و وای لێ بکەیت بەرەو دواوە بڕوات، هێزێکی زیاتری پێویستە.

لێرەدا شێوازە دەروونییەکە زۆر ڕوونە. کاتێك کەسێك دەڵێت "نەخێر" وە لە دڵەوە وادەڵێت، ئەو کەسە تەنها وشەیەکی پێنج پیتی ناڵێت، بەڵکوو تەواوی جەستەی (لیکەڕژێنەکان، دەمارەکان، ماسولکەکان) خۆی کۆدەکاتەوە و دەچێتە قۆناغی ڕەتکردنەوەوە. بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی کات کەسەکە خۆی دەکێشێتە دواوە، ئەمەش لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕوودەدات بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو هەستی پێدەکرێت، یان بەجۆرێك دەوەستێت تێدەگەیت ئامادەی خۆکێشانەوەیە. بەکورتی هەموو دەمار و ماسولکەکان دەچنە ئامادەباشییەوە و دژی قایل بوون دەوەستن. بەپێچەوانەوە کاتێك کەسێك دەڵێت "بەڵێ" بەهیچ شێوازێك خۆی دوور ناگرێت و ناکشێتەوە دواوە. هەموو ئەندامەکانی دەچنە دۆخی پێشوازیکردن و قەبوڵکردنەوە. لەبەر ئەوە هەتا لەسەرەتاوە "بەڵێ"ی زیاتر بەدەست بهێنین، ئەگەری سەرکەوتنمان زیاترە لە ڕاکێشانی سەرنجی گوێگر بەلای قسەکانماندا.

ئەم وەڵامی بەڵێیە تەکنیکێکی زۆر سادەیە. کەچی بڕوانە چەندە فەرامۆش کراوە! هەندێك پێی وایە بە بەرهەڵستیکردن و بەرپەرچدانەوەی بەرانبەر هەر لە سەرەتای قسەکانەوە، خۆی دەسەلمێنێت و هەست بە گرنگی خۆی دەکات. زۆرجار دەبینیت کەسێکی توونڕەو خۆی دەکات بە کۆنفرانسەکەدا و دەچێتە سەر دوانگە: دەست دەکان بە قسەکردن و بەحەماسەوە هەمووان گەرم دەکات و پەمپیان دەدات، بەشێوەیەك قسە بۆ گوێگرەکانی دەکات وەك ئەوەی

شەڕیان پیێ بفرۆشێت. هەر بەڕاست سوودی ئەمە چییە؟ ئەو بۆیە ئەوە دەکات بۆ ئەوەی خوودی خۆی کەمێك چێژ لە بابەتەکە ببینێت، ئەوە دیارە و ڕوونە. بەڵام ئەگەر پێی وابێت بێت سوود لەو شێوازی قسەکردن دەبینێت، ئەوە دیارە مێشکی لەسەر خۆی نییە و گەمژەیەکی تەواوە.

ئایا بەئاشکرا هەست بەوە ناکەیت کە کاتێك کەسێك مشتومڕ لەگەڵ گوێگرەکانیدا دەکات، وایان لێ دەکات زیاتر فەللەڕەق بن، ببنە دووژمن، و کارێك بکات زۆر ئەستەم بێت مێشك و بیرکردنەوەیان بگۆڕن؟ ئایا باشتر و ژیرانەتر ئەوە نییە بە ئەمە دەستپێبکەیت "دەمەوێت ئەوە و ئەوەتان بۆ بسەلمێنم"؟ ئایا هەست ناکەیت بەو شێوەیە باشتربێت؟ لەبەر ئەوەی گوێگرەکانت وەك ڕکابەرییەك (منافەسە) لە قسەکانت دەڕوانن و لە دڵی خۆیاندا دەڵێن، "دەی بزانم چۆن دەتوانیت"؟

ئایا باشتر نییە لە دەستپێکی قسەکانتدا سەرنج بخەیتە سەر شتێك کە خۆیشت و گوێگرەکانیشت بڕواتان پێیەتی، ئەنجا دواتر هەندێ پرسیاری پەیوەندیدار بکەیت کە هەمووان تامەزرۆی وەڵامەکەی بن؟ دوای ئەوە لەگەڵ گوێگرەکانتدا بەدوای وەڵامدا بگەڕێن. گوێگر بڕوای زیاتر بەو شتەیە کە خۆی دۆزیویەتییەوە.

لە هەموو مشتومڕێکدا، گرنگ نییە جیاوازییەکان چەندە زۆر و تاڵ بن، هەمیشە خاڵێکی هاوبەش هەیە کە قسەکەر دەتوانێت هەمووانی بۆ ڕاکێشێت. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە: لەساڵی ١٩٦٠ دا، سەرۆك وەزیران بەریتانیای گەورە، هارۆڵد ماکمیلان، ووتاری بۆ پەرلەمانی هەردوو ئەفریقیا دەدا - ئەریقیای باکور و باشور. دەبوو لە ووتارەکەیدا باس لە بۆچوونی وڵاتەکەی خۆی بکات کە چەندێك دژی ڕەگەزپەرستین، چونکە

لەوکاتەدا ڕەگەزپەرستی لە ئەفریقادا سیاسەتێکی زۆر باو بوو. ئایا کە دەستی بە قسەکردن کرد، باسی لەو جیاوازییەی کرد کە لەنێوان خەڵکی بەریتانی و ئەفریقیدا هەیە؟ نەخێر. باسی ئەو پێشکەوتنە ئابوورییە گەورەی کرد کە ئەفریقیای باشور بەخۆیەوە بینیویەتی، باسی گرنگی بەشداریکردنی ئەفریقیای باشوری کرد لە بازرگانی و جموجوڵی بازاڕەکانی جیهاندا. دواتر بە کارامەیی و تاکتیکەوە هەندێك پرسیاری وروژاند کە تایبەتبوون بە ڕاجیاوازەکانی هەردوو لایەنەوە. ئاماژەی بەوەدا کە دەزانێت جیاوازی بوونی هەیە و ئەم جیاوازییەش کە لەنێوان هەردوو لایەندا دروست بووە بەهۆی هەندێك بیرکردنەوە و بڕاوی دلسۆزانەیە. بەم شێوەیە وتی: "وەك ئەندامێکی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەرکی ئێمەیە پاڵپشتی ئەفریقیای باشور بکەین و هاندەرێکی ڕاستەقینەیان بین، بەڵام هیوام وایە لەوە تێبگەن کە لەڕووی سیاسییەوە هەندێك ئاستەنگ هەن کە کارەکەمان ئەستەم دەکەن، گەر بەهەڵە تێنەگەشتبین پێمان وایە چارەنووسی ئازادی لەم ولاتەدا لەمەترسیدایە. ئەو ئازادیەی کە ئێمە چەندین ساڵە لە وڵاتەکەی خۆماندا کاری بۆ دەکەین. بەڕای من پێویستە وەك دوو هاوڕێ ڕووبەڕووی ئەم بابەتە ببینەوە، بەبێ بەرژەوەندی تایبەت یان تاوانبارکردنی یەکدی، چونکە هەر ئەمەیە بووەتە هۆی دروستبوونی دووبەرەکی و جیاوازی لەنێوانماندا."

گرنك نییە گوێگر چەندێك خۆی لە قسەکەر جیادەکاتەوە و سوورە لەسەر قسەی خۆی، قسەیەکی لەو شێوەی سەرۆك وەزیران بەتەواوی قایلت دەکات و قەناعەتت پێ دەهێنێت.

ئایا چی دەبوو گەر سەرۆك وەزیران، ماکمیلان، لەبری ئەوەی ئاماژەی بە خاڵە هاوبەشەکان کردبا، هەر لەسەرەتای قسەکانییەوە ئاماژەی بە جیاوازیی سیاسەتی هەردوو وڵاتی بکردایە و جیاوازییەکانی بخستایەتەڕوو؟ کتێبە ناوازەکەی پرۆفیسۆر جەیمس هاری، *ژیری بڕیاردان*، لەڕووی دەروونییەوە وەڵامی ئەوەمان دەداتەوە:

هەندێ جار بەبێ هیچ پێداگیرییەك یان بەبێ هیچ هەستێکی قووڵ (ترس، خەمباری، ڕق، تووڕەیی، ...هتد) بڕیار دەگۆڕین و تێگەشتنمان دەگۆڕێت، بەڵام ئەگەر پێمان بڵێن هەڵەین، زیاتر پێداگیری دەکەین و دڵمان ڕەقتر دەکەین بەرانبەر ئەو کەسە و قسەکانیشی. ئێمە زۆر بێ ئاگاین لە شێوازی بیرکردنەوەکانمان، بەڵام کاتێك کەسێك هەوڵدەدات ئەو بیروڕایەمان لێ بسێنێت، بەتەواوی پێداگیر دەبین و زیاتر لەسەر بیرکردنەوە و بۆچوونەکانمان سوورتر دەبین. هۆکارەکەی ئەوە نییە کە خوودی بۆشوون و بیرکردنەوەکان بەلامانەوە خۆشەویستن، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کەسایەتی و خۆپەسەندیمان دەکەوێتە ژێر مەترسییەوە. وشەی خۆم یان می خۆم سەرەکیترین وشەیە لە دروستبوونی هەموو کێشەکاندا، هەروەها دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی ئەو دەستەواژەیە دەرگایەکە بۆ گەشتن بە ژیری. ئەم دەستەواژەیە هەمان کاریگەری ئەم دەستەواژانەی هەیە: خانووەکەم، نانی نیوەڕۆم، بە بڕوای من، شارەکەی من، خودای من. ئێمە تەنها دژایەتی ئەوە ناکەین کەسێك پێمان بڵێت کاتژمێرەکەمان هەڵەیە، یان بڵێت ئۆتۆمبیلەکەمان داشقەیە، بەڵکوو بریندارکردنی کەسایەتی و شتەکانمان پێ ناخۆشە. ئێمە بەردەوام بڕوامان بەو شتەیە کە پێی ڕاهاتووین و بەڕاست وەرمان گرتووە، بۆیە

هەرکاتێك کەسێك گومانێك لەسەر ئەو شتە دروست بکات کە ئێمە بەڕاستی دەزانین، توڕە دەبین و بەرهەڵستی کەسەکە دەکەین و هەموو ڕێگایەك دەگرینە بەر بۆ ئەوەی بیانوویەك بدۆزینەوە و بیرکردنەوەکەی خۆمان بسەلمێنین. سەرەنجام زۆربەی بەناو بیرکردنەوەکانمان بۆ ئەوە تەرخان دەکەین مشتومڕ بکەین و لەسەر بڕاو و قەناعەتی خۆمان بەردەوام بین.

## سێیەم/ بە پەرۆشییەکی گوازراوەوە قسەکانت بکە

کاتێك قسەکەر بە پەرۆشییەکی گوازراوەوە قسە دەکات و بیرۆکەکانی دەخاتەڕوو، کەمتر بیرۆکە و شتی دژیەك لە مێشکی گوێگردا دروست دەبێت. مەبەست لە بەکارهێنانی وشەی "گوازراوە" بۆ پەرۆشی ئەوەیە کە هەموو بۆچوون و بیرکردنەوەیەکت بەلاوە بنێیت کە دژی گوێگرە. بۆ ئەوەی هەستی بەرانبەر بجوڵێنیت، دەبێت لەوپەڕی پەرۆشی و دڵسۆزیدا بیت. کەسی قسەکەر بەدەر لەو دەستەواژە خەماویانەی بەکاری دەهێنێت، بەدەر لەو بەسەرهاتانەی کۆیکردوونەتەوە، بەدەر لەو گونجانەی لەنێوان قسەکانی و ڕەفتارەکانیدا هەیە، ئەگەر بەدڵسۆزی و بەپەرۆشەوە قسەی نەکرد، هەمووی وەك کۆمەڵێك قسەی بریقەداری بێکەڵ وایە و اریگەری دروست ناکات. ئەگەر دەتەوێت کاریگەری دروست بکەیت، خۆت کاریگەر بە. ئەو ڕۆحییەت و کەسایەتییەی لە ناخەوە هەستی پێدەکەیت، بەدەست خۆت نییە ڕاستەوخۆ لەگەڵ گوێگرەکانتدا کارلێك دەکات، لە چاوەکانتدا دەدرەوشێتەوە، لە دەنگتدا تیشك دەداتەوە، هەروەها لە ڕەفتارتدا ڕەنگدەداتەوە.

هەرکاتێك کە قسە دەکەیت، ئەوەی تۆ دەیکەیت هەڵوێستی گوێگرەکانت دیاریدەکات، بەتایبەت ئەو کاتەی مەبەستت قایلکردنی بەرانبەرە. ئەگەر نەرمونیان و دڵسۆز بیت، گوێگرەکانیشت بەو شێوەیە دەبن. ئەگەر توند و بەرهەڵستکاریان بیت، ئەوانیش وا دەبن بەرانبەرت. هێنری وارد بیچەر بەم شێوەیە نووسیویەتی: "کاتێك لە ووتارێکدا گوێگرەکان خەویان لێکەوتووە، پێویستە کەسێك بنێریت چوکڵێکی تیژ بژەنێت بە ووتاربێژەکەدا."

جارێکیان لە زانکۆی کۆلۆمبیاوە لەگەڵ دوو کەسی دیکەدا بانگێشت کرابووین مەدالیای زیوی ببەخشین. لەوێ هەندێ خوێندکاری لێبوو کە هەموویان بەباشی مەشقیان کردبوو، هەموویان تامەزرۆ بوون بتوانن ئاستێکی باش پێشکەش بکەن. بەڵام - تەنها یەکێکیان نەبێت - هەموویان ئەوەی هەوڵیان بۆ دەدا بردنەوەی مەدالیاك بوو. بەداخەوە هیچ هەوڵێکیان نەدەدا گوێگرەکانیان قایل بکەن.

بابەتەکانیان بۆ ئەوە هەڵبژاردبوو تەنها لەبەر ئەوەی بۆ ووتاردان دەگونجا و بابەتێکی شیاو بوو، بەڵام خۆیان هیچ ئارەزوو و حەزێکی تایبەتییان نەبوو بۆی. بۆیە هەموو قسەکانیان تەنها لەشێوەی کۆمەڵێك مەشق و ڕاهێنان بوو کە بۆ ووتاردان کردبوویان.

ئەو کەسەی جیاواز بوو شازادە زولو بوو. ئەم بابەتەی هەڵبژاردبوو قسەی لەسەر بکات "بەشداری ئەفریقیا لە شارستانییەتی نوێدا." هەموو وشەیەکی لە هەستێکی قووڵ و چڕەوە دەردەبڕی. قسەکانی تەنها وەك مەشق و ڕاهێنان نەبوو: بەڵکوو بابەتێکی زیندوو بوو، بە تامەزرۆییەکی زۆر و قەناعەتێکی بەهێزەوە هەڵدەقولان. وەك نوێنەری خەڵك و

وڵاتەکەی قسەی دەکرد. بەژیری، کەسایەتییەکی بەرز، و ناوەڕۆکێکی گونجاوەوە توانی پەیامی خەڵکەکەی بە ئێمە بگەیەنێت و تێمان بگەیەنێت هیواو ئاواتی گەلەکەی چییە.

هەرچەندە زۆر لەوانی دیکە کارامەتر و زیرەکتر نەبوو، بەڵام مەدالیاکەمان بەخشی بە ئەو. ئەوەی دادوەران هەستیان پێکردبوو ئەوەبوو کە قسەکانی دڵسۆزی و پەرۆشییان لێدەچۆڕا و وەك ئاگر بزوسکەی دەدا. ئاگرێك بوو ڕاستی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانی دیکە وەك خەڵووزێکی بچووك گڕیان پێوەبوو. ئەو خوێندکارە ئەوەی دەزانی کە تەنها بە بەکارهینانی ئەقڵ و ژیری ناتوانیت ناخی خۆت لە یەك ووتاردا بخەیتەڕوو: بۆ دەرخستنی ناخی خۆت دەبێت بەشێوەیەك قسە بکەیت گوێگر تێبگات کە لە ناخی دڵەوە بڕوات بەوە قسانەت هەیە و قسەی دڵتە دەیانکەیت.

## چوارەم/ڕێز و خۆشەویستی بەرانبەر گوێگرەکانت بنوێنە

د.نۆرمان ڤینسێنت دەڵێت: "کەسایەتی مرۆڤ پێویستی بە ڕێز و خۆشەویستییە. هەموو مرۆڤێك لەناخی خۆیدا هەست بە بەها و ڕێز و شکۆی خۆی دەکات. ئەو هەستە بریندار بکەیت تا مردن ئەو کەسەت لەکیس دەچێت. لەبەر ئەوە کاتێك کەسێکت خۆشدەوێت و ڕێزی دەگریت، ئەو کەسە بەهێز دەکەیت، ئەویش بەگوێرەی ئەوە ڕێزت لێ دەگرێت و خۆشی دەوێیت.

"جارێکیان لەگەڵ کەسێکی کۆمیدییدا لە بەرنامەیەکدا بووم. بەباشی نەمدەناسی، بەڵام لەو چاوپێکەوتنەوە بۆم دەرکەوت ئەو کابرایە کێشەی هەیە، پێم وابێت دەشزانم هۆکارەکەی چی بوو.

"بەبێدەنگی لەتەنیشتییەوە دانیشتبووم، کاتی ئەوە بوو من قسە بکەم. پێی گووتم، 'نەشڵەژاویت، وایە؟'

"وتم، 'با کەمێك، بۆچی؟ من هەمیشە پێش ئەوەی هەستم و بڕۆمە بەردەم گوێگرەکانم کەمێك دەشڵەژێم. من ڕێزێکی زۆرم بۆ گوێگرەکانم هەیە و ئەو بەرپرسیارێتییەی لەسەر شانمە وام لێدەکات کەمێك نیگەران و شڵەژاوبم. ئەی تۆ ناشڵەژێیت؟'

"وتی، 'نەخێر. بۆ دەبێت بشڵەژێم؟ گوێگر بە هەموو شتێك فریودەخوات. کەسی گەمژە زۆرە.'

"منیش وتم، هاوڕا نیم لەگەڵت. ئەوان دادوەری سەرەکیی تۆن. من ڕێزێکی زۆر لە گوێگرەکانم دەگرم."

بەڵێ، کاتێك د.نۆرمان بەدواداچوونی کرد و بۆی دەرکەوت ئەم کابرا ناوبانگێکی زۆر کەمی هەیە، ئەوکات زانی هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەم کابرایە وەك دوژمن لە گوێگرەکانی دەڕوانێت، وەك لەوەی ڕێز و خۆشەویستی هەبێت بۆیان.

وانەیەکی چەندە گرنگە بۆ کەسێك کە بیەوێت قسەکان و پەیامەکەی بگەیەنێت بە کەسانی دیکە!

## پێنجەم/بەڕوویەکی خۆشەوە دەست پێی بکە

جارێکیان کەسێکی بێدین (ئاتایست) تەحەدداى ویلیام پەیلیی کرد کە بیروڕاکەی بەدرۆ بخاتەوە و بیسەلمێنێت کە خودایەك بوونی هەیە. پەیلی زۆر بەبێدەنگی کاتژمێرەکەی دەستی داکەند، ئەنجا هێنایە پێشەوە و وتی: "ئەگەر بڵێم ئەو هەمووە وردە پارچە و پیل و برغۆ وردەیە خۆیان خۆیان دروستکردووە و پێکەوە نووساون و بەویستی خۆیان دەجوڵێن، ئایا بە شێتم نازانیت؟ بێگومان پێم دەڵێیت شێت. دەی تەماشای ئەستێرەکانی سەرت بکە. هەر یەکەیان ئاڕاستەیەکی دیاریکراو و جولەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە - زەوی و هەسارەکانی دیکەی دەوری خۆر، لەگەڵ ئەوەشدا هەر یەکەیان ڕۆژانە یەك ملیۆن میل زیاتر دەبڕن. چەندەها ئەستێرەی دیکە هەیە کە وەك خۆرێکە و کۆمەڵەی خۆی هەیە، وەك کۆمەڵەی خۆری خۆمان بەخێراییەکی زۆرەوە دەجوڵێن. کەچی هیچ پێکدادانێکیش ڕوونادات، هیچ تیکچوونێك نابینیت، هیچ تێکەڵبوونێك ڕوونادات. هەموویان بێدەنگ، چالاك، و ڕێکوپێکن. ئایا کامیان ئاسانترە: بڕاوت وابێت کەسێك ئەمانەی دروست کردووە یان لەخۆوە دروست بوون؟"

ئێستا وای دابنێ ویلیام پەیلی هەر لە یەکەم ساتەوە بەم شێوەیە وەڵامی ڕکابەرەکەی دەدایەوە: "خودا نییە؟ گەمژە مەبە کابرا. خۆیشت نازانی باسی چی دەکەیت." چی ڕووی دەدا؟ زۆرانبازییەکی زارەکی دروست دەبوو - جەنگێکی پڕ لە مشتومڕ ڕوویدەدا. کابرای ئەتایست بە پەرۆشەوە هێرشی کردە سەری بۆ ئەوەی داکۆکی لە بیروڕاکەی خۆی بکات. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی، وەك پرۆفیسۆر ئۆڤەرستریت ئاماژەی پێدا،

ئەو قسانە بیروڕای کەسی بێدین خۆی بوون، بەها و نرخی خۆی بوو، گەر بەو شێوەیە وەڵامی بدایەتەوە ڕێز و شکۆی دەکەوتە مەترسییەوە. لێرەدا بابەتەکە خاوەندارێتییە نەك ڕاست و هەڵە.

مادەم ڕێز و شکۆ تایبەتمەندییەکی ئەوەندە بنەڕەتی و مەترسیداری سروشتی مرۆڤە، ئایا کارێکی ژیرانە نییە گەر ئەو تایبەتمەندییە لەبەرژەوەندی خۆمان بەکار بهێنین، وەك ئەوەی پەیلی کردی؟ ئەمەش بەوە دەبێت بەشێوەیەك قسە بۆ ڕکابەرەکەمان بکەین، کە ئەو شتەی ئێمە باسی دەکەین زۆر لەو شتە دەچێت ئەو بڕوای پێیەتی. ئەمە وای لێدەکات ئاسانتر قەبووڵت بکات وەك لەوەی ڕەتت بکاتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی خۆت دوور بگریت لەوەی قسەیەك بکەیت گوێگرەکەت بۆچوونی دژ بە تۆی بۆدروست بێت و هەوڵبدات دژایەتیت بکات.

پەیلی بەباشی لەوە تێگەشتبوو مێشکی مرۆڤ چۆن کاردەکات، بەڵام بەداخەوە کەم کەس ئەو توانایەی هەیە لەگەڵ کەسی بەرانبەریدا دەست لەناو دەست بچنە ناو قەڵای بڕواکانی ئەو کەسەوە و پێکەوە گەشتێك بەناو بیرکردنەوە بۆچوونەکانیدا بکات. پێیان وایە گەر بیانەوێت قەڵای بیروڕاکانی بەرانبەرەکەیان داگیر بکەن، پێویستە زریان و باوبۆرانی بەسەردا بڕێژن، هێرش بکەنە سەری. دواتر چی ڕوودەدات؟ کاتێك دوژمنایەتی دروست دەبێت، پردەکە بەرزدەکرێتەوە، دەرگاکان دادەخرێن و قوفڵیان لێ دەدرێت، تیرهاوێژەکان کەوانەکانیان ئامادە دەکەن - جەنگی ووشە دروست دەبێت. ئەم جۆرە ئاژاوەو و پشێوییانە ئەنجامێکی بێسوودی دەبێت و هیچ لایەك ناگەن بە قەناعەت. لەبەر ئەوە

هەوڵ بدە بچیتە ناو بیرکردنەوەی بەرانبەرەکەتەوە و قسەیەك نەکەیت بۆنی دژایەتی لێ بێت.

ئەو ڕێگا هەستیارەی من پشتگیری دەکەم و بەلامەوە پەسەندە شتێکی نوێ نییە. ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لەلایەن قەشە پاوڵیشەوە بەکارهێنرا. قەشە پاوڵ ئەم ڕێگا هەستیارەی لە ووتارێکی بەناوبانگیدا بەکارهێنا کە پێشکەشی خەڵکی یۆنانی کرد. ئەوەندە بەشێوەیەکی کارامە و ژیرانە ئەو ڕێگایەی بەکارهێنا، دوای ١٩ سەدە تا ئێستاش گرنگی خۆی لەدەست نەداوە و ئێمە بەکاری دەهێنین. پاوڵ پیاوێکی خوێندەوار بوو، دوای بوونی بە مەسیحی، زمانپاراوی و ڕەوانبێژییەکەی کردی بە یەکێك لە ڕابەرانی ئاینی مەسیحی. ڕۆژێکیان ڕۆشت بۆ ئەسینا، ئەو ئەسینای کە لوتکەی شکۆ و سەربەرزی بوو کەچی وا ئێستا دەپووکێتەوە. ئینجیل لە بارەی ئەو سەردەمەی ئەسیناوە دەڵێت: "هەموو ئەسینایییەکان و کەسانی بێگانەی نیشتەجێی ئەوێ کاتەکانیان لە هیچ شتێکدا بەسەر نەدەبرد تەنها ئەوە نەبێت یان قسەیان بۆ خەڵك دەکرد یان گوێیان دەگرت."

بەڵێ، نە تەلەفزیۆن، نەڕادیۆ، نە هیچ ڕۆژنامە و هەواڵێك، بێگومان یۆنانییەکان لەو سەردەمەدا زۆر سەخت هەوڵیان داوە تاوەکوو شتێکی نوێ فێربن. دواتر پاوڵ هات، ئەوەش بۆ ئەوان شتێکی نوێ بوو. هەمووان لەدەوری کۆبوونەوە، زۆر کەیف خۆش و تامەزرۆ و بەپەرۆش بوون. بردیان بۆ گردی ئاریز[٦]. هەموویان گووتیان: "دەکرێت بزانین ئەو

---

٦ ـ ئاریز بوو لەو سەردەمەدا شوێنێکی تایبەت کە هەموو ووتاربێژ و فەیلەسوفەکانی لێ کۆدەبوویەوە و قسەیان بۆ خەلکی دەکرد ـ وەرگێڕ.

ئایینە نوێیەی باسی دەکەیت چییە؟ چونکە تۆ شتێکی سەیر و نامۆ دەڵێیت و گوێیەکانی ئێمە نەیبیستووە: بۆیە دەمانەوێت بزانین واتای ئەو شتانە چین."

بەواتایەکی دیکە، بانگهێشتیان کرد ووتار بدات، پاوڵیش ڕازی بوو. ڕاستییەکەی خۆیشی هەر بۆ ئەوە هاتبوو. لەسەر بەردێك وەستا، لەسەرەتادا هەندێك شەڵەژا، وەك هەموو ووتاربێژە باشەکانی دیکە. پێش ئەوەی دەستپێبکات ڕەنگە دەستی گەرم کردبێتەوە و قورگی پاك کردبێتەوە ـ ئحم.

پاوڵ ئەو وشانەی پێ خۆش نەبوو کە بۆ بانگهێشتکردنی بەکاریان هێنا: "ئایینێکی نوێ... شتێکی سەیر و نامۆ." ئەوە جۆرێك بوو لە ژەهر، پێویست بوو ئەو بیرکردنەوەیان ڕیشەکێش بکات. ئەوان لەسەر پێ بوون بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر بیروڕایەکی دژ بەوەی خۆیان. لەبەر ئەوە ئەویش حەزی نەدەکرد ئایین و بیروباوەڕەکەی وەك شتێکی سەیر و نامۆ دەربخات. دەیویست بیبەستێتەوە بە شتێکەوە کە خۆیان بڕوایان پێیەتی. ئەمەش وادەکات بیروڕا جیاوازەکانت جواتر پیشان بدات. بەڵام چۆن؟ بۆ ماوەیەك بیری کردەوە، بیرۆکەیەکی زۆر ناوازەی بۆ هات، دەستیکرد بە قسەکردن و ووتارێکی بەناوبانگ و هەمیشە زیندووی پێشکەش کرد: "ئێوە ئەی پیاوانی ئەسینا، هەست دەکەم ئێوە کەسانێکی زۆر دیندار و خواناسن." لەڕاستیدا ئەوان زۆر دیندار بوون، چەند خودایەکیان دەپەرست. شانازییان بە دینداریی خۆیانەوە دەکرد. ئەویش ستایشی کردن و بە قسەکانی خۆشحاڵی کردن. ئەوانیش کەمێك گەرموگوڕییان تێکەوت. یەکێك لە یاساکانی ووتاربێژی سەرکەوتوو

ئەوەیە کە بە نموونەیەک یان ڕووداوێك پاڵپشتی قسەکانت بکەیت. بۆ ئەم مەبەستەش پاولْ ئەمەی گووت: "کاتێک بەلای یەکێك لە پەرستگاکاندا پێپەڕیم، تەماشام کرد لە بەشی پێشەوەی ئەم نووسینە هەڵکۆڵرابوو: *بۆ خودای نادیار.*"

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت ئەو کەسانە زۆر دیندار بوون. ئەوان زۆر لەوە دەترسان بێڕێزی بەرانبەر یەکێك لە خواکانیان بکەن، بۆیە ئەو نوسراوەشیان بۆ ئەو خوا نادیارە هەڵواسیبوو. بە باسکردنی ئەو پەرستگایە، پاولْ ئەوەی دەرخست کە لەخۆیەوە قسە ناکات و مەرایی و ماستاو ناکات: ئەوەی سەلماند کە ئەو قسانەی دەیانکات شتێکی ڕاستییە و خۆی بینیویەتی. بەم شێوە ژیرانە سەرەتای قسەکانی دەستپێکرد: "بۆیە پێویستە بڵێم ئەو خوایەی کە نەناسراوی و نادیاری دەیپەرستن، منی ناردووە بۆ لای ئێوە. ئایا ئێوەش بەمە دەڵێن ئایینی تازە. . . بەمە دەڵێن شتی سەیر و نامۆ؟" بەڕاستی حەیف بۆ ئێوە. ئەو تەنها بۆ ئەوە لەوێ بوو هەندێ ڕاستی لەبارەی ئەو خوداوە باس بکات کە ئەوان بەنەزانی و بێ ئاگایی دەیانپەرست. ئاگات لێیە، ئەو شتەی بڕوایان پێی نەبوو وێنای کرد بەو شتەی کە بڕوایان پێ دەکرد و بەلایانەوە قەبوڵ بوو - ئەوەیە تەکنیکی قسەکردن. باسی تەوبەکردن و زیندووبوونەوەی بۆ کردن، هەندێك ووتەی لە یەکێك لە هۆنراوەکانی خۆیان بۆ خوێندنەوە، ئەنجا تەواو بوو. هەندێك لە گوێگرەکانی گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام ئەوانی دیکە گووتیان، "لەسەر ئەم بابەتە جارێکی دیکە قسە دەکەینەوە."

کێشەی ئێمە کاتێك دەمانەوێت بەرانبەر قایل بکەین تەنها ئەمەیە: دەمانەوێت بۆچوون و بڕواکانمان لە مێشکی بەرنبەرەکەماندا بچەسپێنین و ڕێگە نەدەین بۆچوون و بیروڕای پێچەوانە دروستبێت و سەرهەڵ بدات. زۆرکات لەگەڵ کەسانێکدا قسە دەکەیت کە لەو بابەتەدا جیاوازن لەگەڵت. ئایا لە دائیرە، لەماڵەوە، لە کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییەکاندا بەردەوام هەوڵ نادەیت ئەو کەسانە قایل بکەین و بیانهێنیتە سەر بۆچوونەکەی خۆت؟ ئایا هیچ ڕێگەیەك هەیە شێواز و تەکنیکەکانت بەهێزتر بکات؟ ئایا چۆن دەست دەکەیت بە قسەکردن؟ وودرۆ ویڵسن دەڵێت: "ئەگەر بێیت بۆ لای من و بڵێیت: با دابنیشین و پێکەوە ڕاوێژ بکەین. لە بیرکردنەوەماندا لە یەکتر جیاواز بین، لەوەش تێبگەین کە بۆچی لەیەکتر جیاوازین، خاڵی ناکۆکی نێوانیشمان بزانین، ئەوکات بەزوویی تێدەگەین کە لەڕاستیدا زۆر لەیەکتر جیاواز نین، تێدەگەین ئەو خاڵانەی جیاوازین تیایدا زۆر کەمن، و ئەوانەی کۆکین لەسەریان زۆرن. بۆیە ئەگەر تەنها کەمێك ئارام بگرین، ڕاشکاو بین و حەزمان لەوەبێت پێکەوە ڕێکەوین، ئەوە پێکەوە ڕێکدەکەوین." هیوام وایە هەموو کات ئەو وشانەت لەبیر بێت و لەیادیان نەکەیت.

((بەشی دەیەم))

## ووتاری کتوپڕ و ئامادەنەکراو

ماوەیەك لەمەو پێش هەندێك لە کەسایەتییە بازرگانییەکان و بەرپرسانی حکومەت لە تاقیگەیەکی پزیشکی گەورە کۆبوونەوە. لەوێ باس لە کار و ئەزموون و داهێنانی تاقیگەکانی دروستکرنی دەرمان دەکرا. یەك لەدوای یەك توێژەران و سەرپەرشتیارن هەڵدەستانە سەر پێ و باسی ئەو توێژینەوە گرنگانەیان دەکرد کە لەلایەن پسپۆڕانی خۆیانەوە لە تاقیگەکانیاندا ئەنجامدراوە. ڤاکسینی نوێیان دژی نەخۆشییە گوازراوەکان، دژە بەکتریای نوێ بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی تایبەت بە بەکتریا، دەرمانی هێورکەرەوە بۆ کەمکردنەوەی فشار و گرژی دەروونی لەو تاقیگەدا دۆزرابونەوە. سەرەتا لە ئاژەڵاندا تاقیان کردووەتەوە و دواتر لەسەر مرۆڤ، ئەو توێژینەوانە دەرئەنجام و دەستکەتێکی باشیان هەبووە.

یەکێك لە بەرپرسان بە بەڕێوبەری تاقیگەکەی وت، "ئەمەی کردووتانە شتێکی زۆر تایبەت و ناوازەیە، بەڕاستی پیاوەکانت بێوێنەن. بەڵام بۆچی تۆش وەك ئەوان قسە بۆ ئامادەبووان ناکەیت؟"

بەڕێوبەرەکەش بەدڵتەنگییەوە وتی، "من قاچم دێت بەیەکدا و ناتوانم قسە بۆ خەڵك بکەم."

دوای کەمێك کابرای بەرپرس لەپڕ بەڕێوبەرەکەی گرت و بە دەنگی بەرز وتی، "ئێمە گوێمان لە بەڕێوبەر خۆی نەبوو قسەمان بۆ بکات. لەڕاستیدا

ئەو زۆر حەزی لەوە نییە قسەی فەرمی بکات، بەڵام داوای لێدەکەم چەند وشەیەکمان پێشکەش بکات."

بەڕاستی جێگەی بەزەیی بوو، بەڕێوبەر هەستایە سەر پێی و دوو ڕستە زیاتری بۆ نەوترا. داوای لێبووردنی کرد کە زیاتر قسەی بۆ نەکردین، ئەوە پووختەی قسەکانی بوو. بەڵێ، ئا بەو شێوەیە کەسێك کە زۆر پسپۆڕیش بوو لە بوارەکەی خۆیدا، ئەوەند شەرمن و پەشۆکاو بوو مەگەر تەنها خودا خۆی بزانێت.

باشە بۆ، خۆ پێویستی بەوە نەدەکرد. دەیتوانی خۆی فێری ئەوە بکات لەسەر پێیەکانی خۆی ڕاوەستێت و قسە بکات. تۆش دەتوانیت خۆت فێربکەیت، هەموو کەسێك دەتوانێت. تا ئێستا نەمبینیووە کەسێك لە خولەکانی ئێمەدا جددی بێت و سووربێت لەسەر فێربوون بەڵام فێر نەبووبێت ـ هەموو ئەوانەی مەبەستیان بووە و ئیرادەیان بەهێز بووە بەدڵنیاییەوە فێری ئەوە بوون بەشێوەیەکی کتوپڕ و بێ ئامادەکاری قسە بۆ خەڵك بکەن. ئەوەی زۆر گرنگە لەسەرەتادا دەبێت بیکەیت ئەو شتەیە کە ئەو بەڕێوبەرە نەیکرد - ئازایانە هەستی، ترس و لاوازییت ببەزێنیت و نەهێڵیت بێمتمانەیی بەسەرتدا زاڵبێت. دەبێت سووربیت لەسەر ئەوەی ئەو کارە بکەیت، بەبێ گوێدان بەوەی ئەو کارە چەندە سەخت و ناخۆشە.

ڕەنگە بڵێیت: "ئەگەر قسەکانم ئامادە بکەم و ڕاهێنایان لەسەر بکەم زۆر باشتر دەبم، بەڵام کاتێك لەپڕ داوام لێدەکەن قسە بکەم، قسەم پێ نییە."

ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە کەسێك بتوانێت بیرکردنەوەکانی ڕێك بخات و ٥ خولەك قسە بکات، وەك لەو کەسەی داوی ئامادەکارییەکی زۆر ١ کاتژمێر قسە دەکات. جیهانی پێشکەوتووی ئێستا کە پڕیەتی لە گفتوگۆی زارەکی، ئەوە دەخوازێت بتوانیت بەخێرایی بیرکردنەوەکانت کۆبکەیتەوە و بەپاراوی بیانکەیت بە قسە. لە کۆڕ و کۆبوونەوە گرنگەکاندا کاتێك بڕیارێك دەدرێت، ئەم بڕیارە تاکە کەسێك دەری ناکات، بەڵکوو هەموان لەدەوری مێزی گفتوگۆکان کۆدەبنەوە و بەزۆرینەی دەنگ بڕیار دەدەن. هەر کەسێك لەو کۆبوونەوەدا قسەی خۆی دەکات و دواتر بەڕای زۆرینە بڕیار دەدرێت چی بکرێت و چی نەکرێت. ئا لەم کاتەدا زۆر پێویستت بە قسەی کتوپڕ دەبێت بۆ ئەوەی کاتێك شتێك دەوروژێت، قسەت پێبێت و بتوانیت شتێك بڵێیت.

## یەکەم/مەشق لەسەر قسەکردنی کتوپڕ و لەپڕ بکە

هەرکەسێکی ئاسایی دەتوانێت سەرکەوتووانە و زیرەکانە قسەی کتوپڕ بکات و قسەکانیشی قەبوڵکراو بن ـ قسەی کتوپڕ بەو واتایە دێت "بەبێ خۆ ئامادەکردن ووتار پێشکەش بکەیت، ئەمەش چەند خولەکێك دەخایەنێت و جیاوازە لەوەی کەسەکە ووتارێك پێشکەش بکات، وەك کورتە سیمینارێك، پێشەکییەك لە کۆنفرانس و کۆبوونەوەکاندا، قسەکردن لەسەر بابەتێك بۆ ٥ خوولەك... وە هەروەها." هەندێك ڕێگا هەن دەتوانیت بەهۆیانەوە تواناکانی خۆت بەرەوپێش ببەیت و کاتێك لەپڕ داوات لێدەکرێت قسە بکەیت، بەشێوەیەکی پاراو گوزارشت لە ناخت

بکەیت و پەیامەکانت بەیەنیت. یەکێك لە ڕێگاکان ئەوەیە ئەو ئامڕازە بەکار بهێنیت کە ئەکتەری فیلمەکان بەکاری دەهێنن.

چەند سڵێك لەمەوپێش فرێدریك دەگلس بابەتێکی بۆ ڕۆژنامەی ئەمریکا نووسی، تیایدا باسی یارییەکی فیکری دەکرد کە خۆی و چارلی چاپلن و ماری پیکفۆرد زۆربەی شەوەکان بەدرێژایی دوو ساڵ خەریکی بوون. لەڕاستیدا بابەتەکە زۆر لە یارییەك زیاتر بوو. یارییەکە ڕاهێنان بوو لەسەر ئەو بەشە قورسەی هونەری قسەکردن کە ئێمە باسی لێوە دەکەین ـ هەمووکات ئامادەی قسەکردن بیت و بۆ هیچ پەکت نەکەوێت.

وەك ئەوەی فرێدریك بۆمان باس دەکات، یارییەکە بەم شێوەیە بوو:

هەر یەکێکمان لەسەر پارچە کاغەزێك بابەتێکمان دەنووسی. دواتر کاغەزەکانمان لوول دەکرد و تێکەڵمان دەکرد، یەکێکمان یەکێك لەو پارچە کاغەزانەی هەڵدەبژارد، کاتێك دەیکردەوە، دەبوو بەخێرایی هەستێتە سەر پێ و بۆ ماوەی ٦٠ چرکە قسەی لەسەر بکات. هیچ کاتێك بابەتەکانمان دووبارە نەدەکردەوە. شەوێکیان من گڵۆپیم بۆ دەرچوو قسەی لەسەر بکەم. هەر کەسێك پێ وایە قسەکردن لەسەر گڵۆپ ئاسانە، با تاقی بکاتەوە بزانێت چۆنە. بەڵێ، هەرچۆنێك بوو ئەویشم تێپەڕاند.

مەبەستەکە ئەوەیە هەرسێکمان لەو کاتەی دەستمان کردبوو بەو یارییە تەواو بەرەوپێش چووبووین و گەشەمان کردبوو. لەسەر ژمارەیەکی زۆر بابەتی هەمەجۆر شت فێربووین، بەڵام زۆر لەوەش گرنگتر ئەوەبوو فێربووین چۆن زانیاری و بیرکردنەوەکانمان کۆبکەینەوە و لەپڕ قسە لەسەر بابەتێك بکەین. فێربووین چیتر بۆ قسە دانەمێنین.

لە خولەکانمدا چەندین جار بەشداربووەکانم داوایان لێکراوە بەبێ خۆئامادەکرد هەستن قسە بکەن. ئەزموونی دوورودرێژم ئەوەی فێرکردووم کە ئەم جۆرە ڕاهێنانە (ڕهێنان بۆ قسەکردن بێ ئامادەکاری) دوو کاری گرنگ دەکات: (١) بۆ بەشداربووانی دیکەی خولەکە دەسەلمێنێت کە دەتوانن لەسەر پێی خۆیان بووەستن و قسە بکەن، (٢) ئەم شێوازی قسەکردنە متمانە و دڵنیایی زیاتریان پێ دەبەخشێت بە بەراورد بە قسە و ووتاری ئامادەکراو. تێدەگەن کە ئەگەر هاتوو لەکاتی پێشکەشکردنی کۆمەڵێك بابەتی ئامادەکراودا تووشی کێشە بوونەوە و قسەیان پێنەما و لە شەقام لایاندا، دەتوانن بەشێوەیەکی زیرەکانە خۆیان قسە بکەن و بەردەوام بن تا ئەوکاتەی دێنەوە سەر ڕاستەڕێگاکە.
بۆیە جار جارێك لە خولەکانماندا ڕاگەیەندراوێکی نوێ دەهات و دەیگووت، "ئەمشەو هەریەکێکتان بابەتێکی پێ دەدرێت قسەی لەسەر بکات. نازانن ئەو بابەتە چییە تا ئەوکاتەی هەڵدەستن قسە بکەن. بەهیوای سەرکەوتن!"
چی ڕوویدا؟ کەسێکی ژمێریار بابەتی ڕاگەیاندنی بۆ دەرچوو قسەی لەسەر بکات، کەسێکی ڕاگەیاندکار بابەتی باخچەی ساوایانی بۆ دەرچوو. دەکرا مامۆستایەك قسە لەسەر بانك و بازاڕگەری بکات، کەسێکی بانکیش قسە لەسەر قوتابخانە و فێرکردن بکات. شۆفێرێك باس لە پرۆژەی وەبەرهێنان بکات و وەبەرهێنێکیش باس لە کاری گواستنەوە بکات.
ئایا ئەم کەسانە تەریقدەبوونەوە و وازیان بهێنایە؟ هەرگیز! وەك کەسانێکی پلەبەرز ڕەفتاریان نەدەکرد. هێواش هێواش دەستیان دەکرد بە باسکردنی ئەو بابەتەی بۆیان دەرچووبوو، هەوڵیان دەدا ئەوەی

دەیزانن لەو بارەیەوە بیلێین. ڕەنگە سەرەتا باش نەبووبن، بەڵام خۆ هیچ نەبێت هەستانە سەر پێ، هیچ نەبێت قسەیان کرد. بەلای هەندێکیانەوە شتەکە ئاسان بوو، بەلای هەندێکی تریشەوە قورس بوو، بەڵام کەسیان وازیان نەهێنا و هەموویان بەردەوام بوون: هەموویان هەستیان بەوە کرد دەتوانن زۆر لەوە زیاتر بکەن کە خۆیان بیریان لێ دەکردەوە، زۆر خۆش بوو بەلایانەوە. سەرەنجام لەوە تێگەشتن دەتوانن پەرە بەو توانایە بدەن کە پێشتر پێیان وابوو هەر نییانە.

بەبڕوای من ئەگەر ئەوان بتوانن ئەوە بکەن، هەموو کەسێکی دیکەش دەتوانێت، بەمەرجێك ویستی لەسەر بێت و متمانەی بەخۆی هەبێت. هەتا زیاتریش ئەو کارە تاقی بکەیتەوە، ئاسانتر دەبێت لەبەرچاوت.

ڕێگایەکی دیکە کە لە ڕاهێنانەکاندا بەکاری دەهێنین بۆ ئەوەی خەڵکی بتوانن لەپڕ و بەبێ ئامادەکاری قسە بکەن بریتییە لە تەکنیکی پێکەوەبەستن. ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییە چالاکەکانی خولەکانمان. داوا لە یەکێك لە بەشداربووەکان دەکرێت دەست بکات بە چیرۆکێك و بەجوانترین شێوە بیگێڕێتەوە. بۆ وێنا، بلێت: "ڕۆژی دواتر هەلیکۆپتەرەکەم لێدەخوڕی، لەپڕ کۆمەڵێك فڕۆکەی بچووك نزیك بوونەوە لێم. ویستم نزم ببمەوە، بەڵام یەکێکیان دەستیکرد بە تەقەکردن. منیش. . . " لەم کاتەدا زەنگێکی بۆ لێدەدرێت وەك ئاماژەیەك بەوەی کاتی تەواو بووە، ئەنجا کەسی دوای ئەو هەڵدەستێت و بەردەوامی بە چیرۆکەکە دەدات. تا دەگات بە کۆتا کەسی خولەکە و هەمووان بەشداری دەکەن. جاری وا هەیە چیرۆکەکە ئەوەندە درێژ دەبێتەوە ڕەنگە لەوپەڕی وڵاتەوە سەری دەرچێت و کۆتایی پێ بێت.

بۆ بەرەوپێشبردنی توانای قسەکردن بەشێوەیەکی کتوپڕ و بەبێ ئامادەکری، ئەم ڕێگایە باشترین جۆری ڕاهێنانە. تا زیاتر ڕاهێنان بکەیت باشتر دەبیت و ئاسانتر دەتوانیت بەسەر ئەو بەربەست و ئاستەنگانەدا سەرکەویت کە لە کۆبوونەوەکاندا دێتە ڕێگەت.

**دووەم/مێشکت ئامادەی قسەکردن بکە**

کاتێك بێ ئامادەکاری ئامادەکردبێت داوات لێدەکەن قسە لەسەر بابەتێك بکەیت، بەگشتی هەمووان چاوەڕێی ئەوەت لێدەکەن قسە لەسەر بابەتێك بکەیت کە زۆر شارەزابیت تێیدا. بەڵام کێشەکە ئەوەیە تووشی حاڵەتێکی لەو شێوەیە ببیتەوە و نەتوانیت بڕیار بدەیت قسە لەسەر چی بکەیت. یەکێك لە باشترین ڕێگاکان بۆ ئەوەی لەم کارەدا شارەزا بیت ئەوەیە کە لەمێشکی خۆتدا ئامادەکاری بۆ ئەم حاڵەتانە بکەیت. ئایا ئەگەر ئێستا پێشنیارت بۆ بکەن قسە بکەیت، چی دەڵێیت؟ ئایا باشترین بابەت لەم کاتەدا باسی بکەیت چییە؟ چۆن ئەو پێشنیارەی ئێستا خراوەتە بەردەستت ڕەتی دەکەیتەوە یان قەبوڵی دەکەیت؟

بەڵێ، یەکەم ئامۆژگاری من ئەوەیە: بەشێوەیەك مێشکت ڕابهێنە کە لە هەموو حاڵەتەکاندا ئامادەی قسەکردن بیت. ئەمەش پێویستی بە بیرکردنەوەیە، وە بیرکردنەوەش قورسترین شتە لە دونیادا ئەنجامی بدەیت. من دڵنیام هەموو ئەو ووتاربێژانەی بەبێ ئامادەکاری قسە بۆ خەڵك دەکەن، کاتێك چوونەتە کۆبوونەوەیەك یان بۆنەیەکی گشتی، چەندین کاتژمێر خەریکی شیکاری و لێکدانەوەی ئەو قسانە بوون کە لەو شوێنەدا بیستوویانە. ڕێك هاوشێوەی فڕۆکەوانێك کە هەمووکات ئامادەیە

بۆ ئەوەی لەو حاڵەتە کتوپڕانەدا کە دەڕێت لەهەرکاتێکدا ڕووبدەن زۆر بەوردی مامەڵە بکات. بەڵێ، ئەو کەسەی کە بە ووتاربێژێکی بەناوبانگ ناسراوە و تۆ وا دەزانیت زۆر قسەزانە، پێشتر بۆ ڕاهێنان سەدان جار ووتاری ئامادەکراوی داوە بۆ ئەوەی بتوانێت لە شوێنە جۆربەجۆرەکاندا بەشێوەیەکی کتوپڕ ووتار بدات.

ئەو کاتەی داوات لێ دەکەن قسە لەسەر بابەتێك بکەیت، کێشەکەت ئەوەیە چۆن کاتەکەت ڕێك بخەییت. لەوکاتە کەم و کتوپڕەدا بەگشتی چاوەڕێی ئەوەت لێدەکرێت بۆ ماوەیەکی کورت قسە بکەیت. بیر بکەرەوە بزانە کام لایەنی ئەو بابەتەی قسەی لەسەر دەکەیت لەگەڵ ئەو بۆنەدا دەگونجێت. پۆزش مەهێنەرەوە لەبەر ئەوەی ئەوەی خۆت ئامادە نەکردووە، ئەوە شتێکی چاوەڕوانکراوە و هەموو کات دەکرێت تووشی حاڵەتی لەو شێوەیە ببیتەوە. بەزوویی برۆ ناو بابەتەکەتەوە و دەست پێ بکە. داوات لێدەکەم شوێن ئەم ئامۆژگارییە بکەویت.

### سێیەم/ دەستبەجێ نموونەیەك باس بکە

بۆچی؟ لەبەر سێ هۆکار: (١) ڕزگارت دەبێت لەوەی خۆت ماندوو بکەیت و بیر لە قسەکان بکەیتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەزموونەکان هەمووکاتێك بەئاسانی دێنەوە یادت. (٢) تەواو سەرقاڵ دەبیت بە قسەکردنەوە و نیگەرانی و شڵەژاوییەکەی سەرەتات نامێنێت، ئەمەش دەرفەتی ئەوەت پێدەدات بابەتەکەت گەرمتر بکەیت. (٣) دەستبەجێ سەرنجی ئامادەبووان بەلای خۆتدا ڕادەکێشیت. وەك لە بەشی حەوتەمدا

ئاماژەی پێدرا، باسکردنی ئەو نموونانەی لە ژیانی خۆتدا ڕوویانداوە ڕێگایەکی زۆر بەهێزە تاوەکوو سەرنجی گوێگر ڕاکێشێت.
گفتوگۆکردن پرۆسەیەکی دوولایەنەیە: ئەو کەسەی کە لە ووتارەکانیدا سەرنجی بەرانبەر ڕادەکێشێت، زۆر باش لەوە تێدەگات. کاتێك دەبینێت ئامادەبووان بەبایەخەوە گوێیان بۆ گرتووە و چاوەڕوانی قسەکانی دواترن، ئەمیش پەمپ دەدرێت و هەوڵ دەدات بەردەوام بێت، هەوڵدەدات باشترین ئاست پێشکەش بکات، هەوڵ دەدات بەبایەخەوە لە گوێگرەکانی بڕوانێت. بەم شێوەیە ئەم هۆگرییەی لەنێوان قسەکەر و گوێگردا دروست کلیلی سەرکەوتنە لە قسەکردندا - بەبێ ئەمە گفتوگۆی ڕاستەقینە کارێکی مەحاڵە. لەبەر ئەمەیە داوات لێدەکەم بە نموونەوە دەست پێ بکەیت، بەتایبەت ئەوکاتانەی داوات لێ دەکرێت چەند قسەیەکی کورت بکەیت.

## چوارەم/بەجۆش و خرۆشەوە قسە بکە

وەك ئەوەی پێشتر چەند جارێك لەم کتێبەدا باسکراوە، ئەگەر بە وزە و چوست و چالاکییەوە قسە بکەیت، ئەو چالاکی و پەرۆشییەت کاریگەرییەکی باشی دەبێت لەسەر مێشك و دەروونت. ئایا تا ئێستا بینیووتە لە گفتوگۆیەکی بەکۆمەڵدا کاتێك کەسێك قسە دەکات، لەپڕ دەستی دەجوڵێنێت؟ گەر سەرنج بدەیت دەبینیت ئەو کاتەی دەست دەکات بە جوڵە و بەکارهێنای زمانی جەستەی، ئەنجا بەپاراوی قسەکانی دەکات و زیاتر گەرم دەبێت، هەروەها وردە وردە سەرنجی ئەوانی دیکەش بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، بەڵام سەرەتا کە سست و بێ جوولە

بوو، هیچ کاریگەر نەبوو. لەبەر ئەوە پێویستە ئەوەمان لەیادبێت کە چالاکییە جەستەییەکان پەیوەندییەکی نزیکیان هەیە لەگەڵ مێشکدا. هەر وەك ویلیام جەیمس ئاماژەی پێداوە، هەرکاتێك جەستەمان چالاك بوو، مێشکیشمان بەشێوەیەکی خێرا کارەکانی دەکات.

**پێنجەم/ ئاگاداری خۆت بە**

کاتێك دێت کەسێك لەپشتەوە بەهێواشی دەکێشێت بە سەرشانتدا و دەڵێت "بۆ هەندێك قسەمان بۆ ناکەیت؟" یان ڕەنگە لە کاتێکدا بێت هەر ئاگاداریش نەبیت. بەئاسوودەیی دانیشتوویت و چوویتەتە خەیاڵەوە و گوێت لە قسەکانی بەڕێوبەری ئاهەنگەکە گرتووە، لەپڕ هەست دەکەیت کابرا باسی تۆ دەکات. هەمووان ڕوودەکەنە تۆ و بێ ئەوەی ئاگایشت لەخۆت بێت کابرا تۆی دەستنیشان کردووە و دەبێت دوای خۆی قسە بکەیت.

لە کاتێکی لەو شێوەیەدا ڕەنگە وەك ئەسپسوارێکی سەرخۆش بەهەموو لایەکدا دەڕوات مێشکت تەواو شپرزەبێت. ئەگەر شتێکی وەها ڕوویدا، ئیتر کاتی ئەوەیە هێوربیت و تێکنەچیت. دەتوانیت لەو کاتەی سوپاسی بەڕێوبەرەکە دەکەیت هەناسەیەك وەرگریت. ئەنجا باشترین شت ئەوەیە ئەو قسانەی دەیانکەیت پەیوەست بن بەو کۆبوونەوەوە و زۆر دوورنەکەویتەوە. هەمیشە گوێگر و بینەر بایەخ بە خۆیان و ئەو کارانە دەدەن کە خۆیان ئەنجامیان داوە. لەبەر ئەوە سێ سەرچاوە هەیە کە دەتوانیت بیرۆکەی لێوە ڕابکێشیت و ووتارێکی کتوپڕ بدەیت.

یەکەم خوودی گوێگرەکانە. تکات لێدەکەم گەر دەتەوێت ئاسان قسەکانت بۆ بێت، ئەمەت لەبیر بێت: باسی گوێگرەکانت بکە، ئەوان کێن، چی دەکەن، چی شتێکی باشیان کردووە و سوودیان بە دەوروبەر گەیاندووە. نموونەیەکی دیاریکراو باس بکە.

دووەم خودی بۆنەکەیە. دەتوانیت قسە لەسەر ئەو ڕووداو و بۆنەیە بکەیت کە کۆبوونەوەکەی بۆ سازکراوە. ئایا بۆنەیەکی ساڵانەیە، ئاهەنگی دەرچوونە، ساڵ یادی کەسێك یان شتێکە، بۆنەیەکی سیاسی یان نیشتیمانییە؟

لەکۆتاییدا، ئەگەر گوێگرێکی وریا بووبیت، دەتوانیت ئاماژە بە شتێك بدەیت کە قسەکەری پێش تۆ باسی کردووە و زیاتر لەسەر ئەو بابەتە بووەستیت. سەرکەوتووتریت قسەی کتوپڕ ئەو قسانەن کە زۆر کتوپڕن. ئەو جۆرە قسانە ڕاستەوخۆ گوزارشت لەو هەستە دەکەن کە کەسی قسەکەر بەرانبەر بە گوێگر و خوودی بۆنەکە هەیەتی. وەك چۆن دەستکێش بە دەست دەکات، ئەو قسانەش ئاوا بەو لەگەڵ بارودۆخەکەدا دەکەن، هەر وەك ئەوەی بەرگدوورێك بۆ ئەو بۆنەیەی دووریبێت. ئاگات لێبێت هەمیشە لەم ژێر ئەم قسانەوە سەرکەوتن خۆی حەشارداوە.

### شەشەم/قسەی بێبەرنامە مەکە - بێبەرنامە قسە بکە

لەو قسەی سەرەوەدا جیاوازی هەیە. بەتەنها ئەوە بەس نییە هەر قسە بکەیت و زنجرەیەك شتی تێکەڵ و ناپەیوەست بکەیت بە دەزوویەکی بێئەنجامەوە. دەبێت بۆچوون و بیرکردنەوەکانت بەشێوەیەکی لۆژیکی لەدەوری ئەو پەیامە سەرەکییە ڕێك بخەیت کە دەتەوێت بیگەیەنیت. بۆ

ئەم مەبەستە باسکردنی نموونە زۆر بەسوودە. دیسانەوە ئەگەر بەپەرۆشیی و گەرموگوڕییەوە قسە بکەیت، دەبینیت ئەو قسانەی کتوپڕ و بەبێ بەرامەڕێژی گوتووتە تام و چێژ و کاریگەرییەکی هەیە کە قسەی ئامادەکراو و بە بەرنامە نییەتی.

دەتوانیت ببیت بە ووتاربێژێك کتوپڕ و خێرا قسەکانت بکەیت، بەو مەرجەی لە لەو پێشنیارانە قوولبیتەوە کە لەم بەشەدا خراونەتە بەردەستت. پێویستە مەشق لەسەر هەموو ئەو تەکنیکانە بکەیت لە سەرەتای ئەم بەندەدا باسمان کردوون.

پێویستە لە کۆبوونەوەکاندا ئامادەکارییەکی سەرەتایی بکەیت و ئاگادار بیت نەوەك کەسێك لەپڕ داوات لێ بکات قسە بکەیت. ئەگەر هەستت کرد داوات لێ دەکەن بە توانجێك یان بە پێشنیارێك بەشداری بکەیت و قسەی خۆتت هەبێت، بەوریایی ئاگات لە قسەکەرەکانی دیکە بێت. هەوڵ بدە ئامادەی ئەوە بیت بۆچوون و قسەکانت لە چەند وشەیەکدا پوخت بکەیتەوە. کە کاتی هات، ئەوەی لە مێشکتدایە بەڕوونی بیڵێ. لەوکاتانەدا بۆچوونەکانت بەبایەخەوە تەماشا دەکرێن. بۆیە بەکورتی بیان بێژە و دابنیشە.

هەمووکات نۆرمان بێڵ گیدیس، ئەندازیاری تەلارسازی، دەیگووت: تا هەڵنەسمە سەر پێ ناتوانم بیرکردنەوەکانم بکەم بە وشە. هەموو کاتێك کە لە ئۆفیسەکەیدا لەسەر پرۆژەیەکی ئاڵۆز بۆ هاوبەشەکانی قسەی دەکرد، بەردەوام دەجوڵا و هەر دەهات و دەچوو، وەستانی نەبوو، زۆر بەجوانی ڕەفتاری دەکرد. لەڕاستیدا دەبوو خۆی فێری ئەوە بکات بەدانیشتنەوە قسە بکات، لەکۆتاییدا فێری ئەوەش بوو.

بەنیسبەت خۆمانەوە پێچەوانەیە: دەبێت فێری ئەوە بین بەپێوە قسە بکەین، هیچ ترسیشی ناوێت و دەتوانین ئەو کارە بکەین و فێربین. نهێنییەکەی تەنها لەوەدایە دەستپێ بکەین - یەك ووتاری کورت بدەین - هەم دیسان دووبارەی بکەینەوە، هەم دیسان دووبارە و سێبارەی بکەینەوە. ئەوکات دەبینین هەر ووتارێك لەوەی پێش خۆی ئاسانتر و باشترە. لەوە تێدەگەین کە قسەکردنی کتوپڕ و ئامدەنەکراو هاوشێوەی ئەو قسانەیە کە بۆ هاوڕێکانمان دەیکەین.

## پوختەی بەندی سێیەم

مەبەست لە ووتاری ئامادەنەکراو و ئامادەکراودا

### بەشی حەوتەم: ئامادەکردنی ووتاری کورت بۆ ئەوەی کارێك بە ئامادەبووان بکەیت

یەکەم/ نموونەیەك یان ڕووداوێکی ژیانت باس بکە

نموونەکەت لەسەر ئەزموونێکی تاکەکەسی خۆت دارێژە

کە دەستت بە قسە کرد، وردەکاری نموونەکەت باس بکە

نموونەکەت پڕ بکە لە باسی پەیوەندیدار

دووەم/ ئامانجەکەت بڵێ، دەتەوێت گوێگر و بینەر چی بکەن

سێیەم/ باسی ئەو هۆکارە یان ئەو سوودە بکە کە دەکرێت گوێگر دەستی بکەوێت

دڵنیابە هۆکارەکەت پەیوەستە بە نموونەکەتەوە

تەنها سەرنجت بخە سەر یەك هۆکار ، تەنها یەك دانە

### بەشی هەشتەم: ووتاردان بە مەبەستی پێدانی زانیاری بە گوێگر

یەکەم/ بابەتەکەت سنوردار بکە بۆ ئەوەی ئەو کاتەی بۆت دانراوە بەشت بکات

دووەم/ بەڕیز بیرۆکەکانت ئامادە بکە

سێیەم/ ژمارە بۆ هەر خاڵێك دابنێ کا باسی دەکەیت

چوارەم/ نامۆکان بەراورد بکە بە ئاشناکانەوە

پێنجەم/ هۆکاری بینایی بەکار بهێنە

**بەشی نۆیەم: ووتاردان بەمەبەستی قایلکردنی گوێگر**

یەکەم/ متمانەبەخۆبوون بەدەست بهێنە بەشێوەیەك کە شایستەی بیت

دووەم/ وەڵامی "بەڵێ" بەدەست بهێنە

سێیەم/ بە پەرۆشییەکی گوازراوەوە قسەکانت بکە

چوارەم/ ڕێز و خۆشەویستی بەرانبەر گوێگرەکانت بنوێنە

پێنجەم/ بەڕوویەکی خۆشەوە دەست پێی بکە

**بەشی دەیەم: ووتاری کتوپڕ و ئامادەنەکراو**

یەکەم/ مەشق لەسەر قسەکردنی کتوپڕ و لەپڕ بکە

دووەم/ مێشکت ئامادەی قسەکردن بکە

سێیەم/ دەستبەجێ نموونەیەك باس بکە

چوارەم/ بەجۆش و خرۆشەوە قسە بکە

پێنجەم/ ئاگاداری خۆت بە

شەشەم/ قسەی بێبەرنامە مەکە - بێبەرنامە قسە بکە

# بەندی چوارەم



## هونەری گفتوگۆکردن

بەپێچەوانەی بەندەکانی پێشوو ئەم بەندە لە یەك بەش پێکهاتووە، ئەویش بەتەواوی تایبەتکراوە بە ئەو بابەتەی لەکاتی پێشکەشکردنی ووتاردا قسەی لەسەر دەکەیت.

هاوشێوەی بەندی یەکەم لەم بەندەدا دیسانەوە سەرنج دەخەینە سەر بنەماکانی قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر. ڕەوانبێژی و زمانپاراوی دەرهاویشتەی تامەزرۆبوونتە بەوەی پەیامەکەت بە گوێگر و بینەرەکانت بەگەیەنیت. تەنها بەو شێوەیە دەتوانیت ووتارێکی سروشتی و کتوپڕ پێشکەش بکەیت.

## ((بەشی یانزەیەم))

## قسەکردن

---

ئایا تۆ بڕوا بەوە دەکەی؟ چوار ڕێگە هەیە، تەنها چوار ڕێگە، کە ئێمە بەهۆیانەوە پەیوەندی بە هەموو دونیاوە دەکەین. هەر یەکێك لە ئێمە بەپێی ئەم چوار ڕێگایە پۆلێندەکرێین و هەڵسەنگاندنمان بۆ دەرێت: چی دەکەین، چۆن دەردەکەوین، چی دەڵێین، وە چۆن دەیڵێین. ئەم بەشە باس لە کۆتا دانەیان دەکات - چۆن دەیڵێین.

یەکەم جار کە دەستمکرد بە وانە گووتنەوە لەبواری ووتاربێژیدا، کاتێکی زۆرم تەرخانکرد بۆ ڕاهێنان لەسەر ئەوەی خوێندکارەکانم قورگ و دەنگەژێیەکانیان پەرە پێ بدەن و دەنگیان بەرز و نرم پێ بکەن و هەناسەدرێژ بن. زۆری نەخایاند بۆم دەرکەتن ئەمەی من دەیکەم لە فێرکردنی بەشداربووان کارێکی زۆر بێسوودە. ئەوە بۆ کەسێك باشبوو کە سێ تا چوار ساڵ خەریکی ئەو بابەتە بێت و خۆی بۆ تەرخان بکات. بۆم دەرکەوت پێویستە خوێندکارەکانم لەگەڵ ئەو شێوازە سروشتییەی کە خۆیان هەیانە بەردەوام بن و واز لەوەی ئێستا بهێنن. هەستم کرد ئەگەر بێتو ئەو کاتە زۆرەی لەو جۆرە ڕاهێنانەدا بەسەری دەبەم، تەرخانی بکەم بۆ نەهێشتنی ڕاڕایی و چارەسەرکردنی بەربەستەکانی دیکەی خوێندکارەکانم، ئەوکات دەرئەنجامێکی خێرا و یەکجاریم دەبێت. سوپاس بۆ خودا هەستم بەوە کرد و زوو لە بابەتەکە تێگەیشتم.

**یەکەم/ لە قەباخی خۆت وەرە دەرەوە**

لە خولەکانماندا چەند وانەیەك هەبوون تایبەت بوون بە ئازادکردنی گەنجان لەو بەربەرستە سەخت و ئالۆزەی بۆ خۆیان دروستیان کردبوو. کەوتمە سەر ئەژنۆم، بەڕاستیمە، لە بەشداربووانی خولەکە دەپاڕامەوە لەو قەباخە بێنە دەرەوە و بێن بەچاوی خۆیان ببینن جیهان چەندە بەڕوویەکی خۆشەوە پێشوازییان لێ دەکات. ئەوەی من کردم هەندێك ماندووی کردم، دان بەوەدا دەنێم، بەڵام شایەنی بوو. وەك مارشاڵ فۆچ لە هونەری جەنگدا دەڵێت، "بە زومان ئاسانە و بە کردە گرانە." گەورەترین کۆسپ ڕەقبوونە، تەنها ڕەقبوونی جەستەیی نا، بەڵکوو ڕەقبوونی مێشکیش، ئەو جۆرە ڕەقییانەی کە چارەسەر دەکرێت.

کارێکی ئاسان نییە بتوانیت لەبەردەم گوێگر و بینەردا سروشتی و ئاسایی دەرکەویت. ئەکتەرەکان باش لەوە تێدەگەن. کاتێك منداڵ بوویت، با بڵێیت چوار ساڵان بوویت، ڕەنگە بتوانییا بچیتە سەر دوانگەیەك و بەشێوەیەکی سروشتی قسە بکەیت. بەڵام کاتێك بیست و چوار ساڵیت و دەچیتە سەر دوانگە دەتەوێت قسە بکەیت، چی ڕوودەدات؟ ئایا پارێزگاری لەو سروشتیبوونە دەکەیت کە لە چوار ساڵیدا هەتبوو؟ ڕەنگە، بەڵام دڵنیام ڕەق و شەرمن دەبیت و وەك کیسەڵ دەچیتەوە قەباغی خۆت.

کێشەی فێرکردن یان ڕاهێنانی گەنجان لە قسەکردندا ئەوە نییە کەسایەتی و تایبەتمەندی جۆربەجۆر بۆ خۆیان دروست بکەن: کێشە ئەوەیە تەگەرەکان لاببەن و بتوانن بە تایبەتمەنی و کەسایەتی بنەڕەتی خۆیان و هەمان ئەو شێوە سروشتییەی منداڵی قسە بکەن.

سەدان جار قسەکەرم لە ناوەڕاستی قسەکردندا وەستاندووە و تکام لێ کردووە "وەك مرۆڤ قسە بکات." چەندین شەو کە گەڕاومەتەوە مێشکم تەواو شەکەت و ماندوو بووە ئەوەندە ڕاهێنانم بە قوتابییەکان کردووە و هەوڵم لەگەڵدا داون بەشێوەیەکی سروشتی قسە بکەن. بڕوا بکە ئەوەندەش ئاسان نییە کە بیری لێدەکەیتەوە.

لە یەکێك لە وانەکانمدا داوام لە قوتابییەکان کرد پارچ دەقێك بکەن بە نواندن. داوام لێکردن بچنە قوڵایی دەقەکەوە و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ ئامادەکاری قسەکان بکەن. کاتێك دەستیان کرد بە نواندن، سەرسام بوون لەوەی هەرچەندە وەك کەسێکی گەمژە نواندن و ڕەفتاریان کرد، بەڵام هیچ هەستێکی ناخۆشیان بۆ دروست نەبوو. هەموو پۆلەکە سەرسام بوون بە توانای هەندێك لە خوێندکارەکان. مەبەستم ئەوەیە کاتێك بەئاسایی و بەفیشقیاتەوە لەبەردەم کۆمەڵێك کەسدا قسەدەکەیت، ناترسیت و خۆت ناکێشیتەوە ناو قەباغەکەت.

ئەو ئازادییە کتوپڕەی هەستی پێدەکەیت وەك ئەو باڵندە وایە کە دوای زیندانی کردنی لە قەفەزێکدا، باڵدەگرێت و دەفڕێ. تێدەگەیت بۆچی خەڵکی بەکۆمەڵ دەڕۆن بۆ تەماشاکردنی شانۆ و فیلمەکان ــ لەبەر ئەوەی دەبینن ئەوانەی نمایش دەکەن هیچ ترس و شەرمێکیان نییە، لەوێ کەسانێك دەبینن کە زۆر بەجوانی هەستەکانیان وەك جلێك لەبەر دەکەن و پیشانی هەمووانی دەدەن.

**دووەم/ هەوڵ مەدە لاسایی کەسانی دیکە بکەیتەوە ـ خۆت بە**

هەموومان بەو ووتاربێژانە کارگەرین کە لە قسەکردندا کارامە و کاریگەرن، ئەو ووتاربێژانەی لە دەربڕینی ناخیان ناترسن، ناترسن لە بەکارهێنانی ڕێگایەکی تایبەت و سەردەمیانە بۆ گەیاندنی ئەو شتانەی پێویستە بە گوێگری بڵێن.

ماوەیەکی کەم دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە لەندەن چاوم بە دوو برا کەوت، ڕۆز سمیس و کێس سمیس. ئەم دوو برایە تازە گەشتیان کردبوو بۆ ئوستوڕالیا بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە ٥٠ هەزار دۆلاریەی کە حکومەتی ئوستوڕالیان پێشکەشی کردبوون. ئەم دوو برایە لە تەواوی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیادا دەنگیان دابوویەوە، هەروەها پاشای وڵات ناسناوی سوارچاکی پێدابوون[٧].

کاپتن هێرلی کە وێنەگرێکی بەتوانا بوو، لەگەڵیان ڕۆشتبوو بۆ ئەوەی وێنەیان بگرێت. بۆیە منیش هاوکاریم کردن تاوەکوو بتوانن ئە وێنانە بەکاربهێنن و ووتارێك لەبارەی گەشتەکەیانەوە ئامادە بکەن، هەروەها مەشق و ڕاهێنانی باشیشم پێکردن. بۆ ماوەی چوار مانگ هەموو ڕۆژێك دووجار لە هۆڵی فیلهارمۆنی، لەندەن ئەو ووتارەیان پێشکەش دەکردن، جارێك دوانیوەڕوان و ئەویتر شەوان.

ئەوەی جێگەی سەرنج بوو ئەوەبوو هەردووکیان پێکەوە شان بە شانی یەکتر گەشتیان کردبوو، هەمان ئەزموونیان هەبوو، هەمان ووتاریشیان پێشکەش دەکرد، زۆربەی وشەکانیشیان وەك یەك بوون.

---

٧ ـ لەو سەردەمەدا پلەی سوارچاك پلەیەکی بەرز بوو ـ وەرگێڕ.

کەچی بەجۆرێك لە جۆرەکان لە دوو ووتاری جیاواز دەچوون و هەر یەکەیان شێوازی خۆی هەبوو.

بەدەر لە وشەکان شتێکی دیکە هەیە کە گرنگی خۆی هەیە، ئەویش ئەو تام و چێژەیە کە قسەکانی پێ دەڕازێنیتەوە. ئەوە گرنگ نییە چەندێك بڵێیت، گرنگە ئەوەیە چۆن دەیڵێیت.

برولۆف، گەورە وێنەکێشی ڕووسی، بینی یەکێك لە خوێندکارە منداڵەکانی وێنە دەکێشێت، ئەمیش چوو هەڵەیەکی بۆ ڕاست کردەوە. منداڵەکە تەماشای وێنەکەی کرد و بەسەرسوڕمانەوە وتی: "بۆچی، خۆ تەنها یەك تۆز دەستت لێدا، بەڵام تەواو بوو بە شتێکی دیکە و گۆڕا." برولۆفیش وەڵامی دایەوە، "هونەر لە پارچ بچووکەکانەوە دەستپێدەکات." ئەمەش بەهەمان شێوەی وێنەکێشان بۆ قسەکردنیش ڕاستە.

کاتێکیش کەسێك دەستکاری وشەکانی دەکات هەمان شت ڕوودەدات. ووتەیەکی کۆن هەیە کە لە پەرلەمانی بەریتانیادا بەکاردەهێنرا: هەموو شتێك بەندە بە شێوازی قسەکردنەوە نەك خوودی قسەکان. ئەوکاتەی ئینگیلتەرا داگیرکراوی ڕۆم بوو، کوینتیلیانی گەورە نووسەری ڕۆم ئەو قسەیەی کردبوو.

"هەموو ئۆتۆمبیلەکانی کۆمپانیای فۆرد وەك یەکن، بەڵام هیچ دوو کەسێك لەیەك ناچن." ئەمە قسەی بەڕێوبەری کۆمپانیاکە بوو. هەموو ژیانێکی نوێ کە بەکەسێك دەبەخشرێت شتێکی نوێیە: پێشتر هیچ شتێك نەبووە لەو کەسە چووبێت، وە هیچ شتێکیش نییە لەداهاتوودا لەو بچێت. بۆیە دەبێت کەسێکی گەنج بەوشێوەیە لەخۆی بڕوانێت: دەبێت

بۆ ئەو تایبەتمەندییە تاکەی خۆی بگەڕێت کە لەوانی دیکە جیای دەکاتەوە و دەیگەیەنێت بە هەموو ئەوشتانەی شایەنێتی. کۆمەڵگە و قوتابخانە هەوڵدەدەن ئەو تایبەتمەندییەت لێ ون بکەن، بەڵام من دەڵێم ڕێگە نەدەیت ئەو تروسکاییەت بکوژێننەوە. ئەوە تاکە هۆکاری تۆیە بتوانیت خۆتی پێ بسەلمێنیت.

هەموو ئەمانە بۆ ووتاربێژی دووقات ڕاستن. لە دونیادا هیچ مرۆڤێکی دیکە نییە لە تۆ بچێت. بە ملیۆنان کەس دوو چاو و لووتێك و دەمێکیان هەیە، بەڵام هیچ یەکێکیان بەتەواوی لەویتر ناچێت، وە هیچ کەسێکیان هەمان کەسایەتی و ڕەفتار و بیرکردنەوەی تۆیان نییە. تەنها کەمێکیان وەك تۆ دەتوانن گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن. بە واتایەکی دیکە، تۆ کەسایەتی خۆتت هەیە. وەك ووتاربێژێك ئەوە بەنرخترین سامانتە. دەستی پێوە بگرە، ئاگات لێی بێت، و پەرەی پێ بدە. هەر ئەو کەسایەتی و تایبەتمەندییەیە کە هێز و توانا بە قسەکانت دەبەخشێت، تامەزرۆیی و حەماس لە قسەکانتدا دروست دەکات. "ئەوە تاکە هۆکاری تۆیە بتوانیت خۆتی پێ بسەلمێنیت." تکات لێدەکەم، خۆت مەخەرە قاڵبی کەسێکی دیکەوە و شێوەی ڕاستەقینەی خۆت بزر مەکە.

**سێیەم/ لەگەڵ ئامادەبووواندا وتووێژ بکە**

با بەسەرهاتێکت بۆ باس بکەم کە نموونەی شێوازی قسەکردنی هەزران کەسە. جارێکیان ڕێکەوت وابوو لە مەرین، هاوینەهەوارێکی نزیك نزجیرەچیاکانی سویسرا، بووەستم. لە ئوتێلێك مامەوە کە کۆمپانیایەکی لەندەنیی بەڕێوەی دەبرد: هەفتانە دوو ووتاربێژیان دەنارد بۆ ئەوەی قسە بۆ گوشتیارەکانی ئەو ناوچەیە بکەن. یەکێکیان نووسەرێکی بەناوبانگی ئینگلیز وو. ناونیشانی قسەکانی بریتی بوو لە "داهاتووی ڕۆمان." ئاماژەی بەوە دا کە خۆی بابەتەکەی هەڵنەبژاردووە، لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو هیچ شتێکی گرنگی پێ نەبوو باسی بکات. دیاربوو بەپەلە هەندێك تێبینی سەرپێیی نووسیبوو. لەبەردەم ئامادەبوواندا وەستابوو، تەواو گوێگرەکانی فەرامۆش کردبوو، تەنانەت هەر سەیریشی نەدەکردن. هەندێ جار چاوی دەبڕییە سەقفەکە، هەندێ جار تەماشای تێبینییەکانی دەکرد، هەندێ جاریش سەیری زەوییەکەی دەکرد. بەشێوازێکی زۆر سەرەتایی و کۆن قسەکانی دەکرد و هیچ هەست و سۆزێك نە بە قسەکانی نە بە ڕووخسارییەوە دیار نەبوو.

لەڕاستیدا ئەوە هەر ووتار نەبوو پێشکەشی کرد، ورتە ورت بوو. هیچ *پەیامێکی* تێدا نەبوو. یەکەم بنچینەی گفتوگۆ و قسەکردنە هەبوونی پەیام و مەبەستێکی ڕوونە. پێویستە گوێگر وا هەست بکات لە دڵ و مێشکی قسەکەرەوە پەیامێك دەگات بە مێشك و دڵی ئەوان. ئەو قسانەی ئێستا بۆم باسکردیت دەتگووت بۆ دار و بەرد دەکران. بڕوا بکە دەتگووت کابرا لە بیاباندا قسەکانی دەکات، نەك بۆ کۆمەڵێك مرۆڤی زیندوو.

## چوارەم/ دڵت ئاوێتەی قسەکانت بکە

دڵسۆزی و پەرۆشی و تامەزرۆیی هاوکارێکی زۆر بەهێزن لە قسەکردندا. کاتێك کەسێك دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەستەکانی، لە قسەکانیدا کەسایەتی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت. قاڵبەکەی فڕێ دەدات، گەرموگوڕی هەستەکانی هەموو بەربەستەکان لادەبات. بەشێوەیەکی سروشتی و خۆڕسکانە ڕەفتار دەکات و دەجوڵێت، بەشێوەیەکی خۆڕسك قسە دەکات، تەواو دەبێتە کەسێکی سروشتی.

دین براون لە وتارێکیدا لە زانکۆی یەیلْ وتی: "هەرگیز نابێت ئەو ووتارە لەبیر بکەم کە هاوڕێیەکم جارێکیان لە کڵێسا پێشکەشی کرد. تا کاتی ووتارەکە هەر خەریکی خوێندنەوە بوو، کە کاتی پێشکەشکردنی ووتارەکە هات، وتی: 'ئێوە هەمووتان دەزانن کەسانی بڕوادار کامانەن پێویست ناکات من باسی بڕوادارانتان بۆ بکەم و پێتان بڵێم بڕوا چییە چەندین پرۆفیسۆر و پسپۆڕ لەو بوارەدا هەن کە زۆر لە من باشتر ڕوونی دەکەنەوە بۆتان. من لێرەم تا هاوکارتانبم چۆن بڕوا بهێنن.' بۆ ئەوەی بڕوا لە دڵ و مێشکی گوێگرەکانیدا بچەسپێنێت دواتر بەشێوەیەکی زۆر جوان و کاریگەر باسی بڕوا و قەناعەتی خۆی کرد بەو شتانەی کە نابینرێن و هەمیشەیین. *دڵی لەگەڵ قسەکانیدا بوو. قسەکانی زۆر کاریگەر بوون چوونکە لە جوانییەکانی ناخی خۆیەوە هەڵدەقوڵان.*"

"دڵی لەگەڵ قسەکانیدا بوو." نهێنییەکەی ئەوە بوو. کەچی کەم کەس ئەم بنەما دەزانێت و بەکاری دەهێنێت. بەڵام کەمێك ناڕوون دیارە، کەمێك ئاڵۆزە. لەڕاستیدا کەسانی سادە و ناکارامە حەز دەکەن کۆمەڵێك بنەما و یاسای زۆر ئاسانیان پێ بڵێیت، شتێکبێت بەئاسانی لێی تێبگەن

و زۆر ڕوون بێت بەلایانەوە، شتێك بێت بتوانن بەئاسانی بەکاری بهێنن، هاوشێوەی داگیرساندنی ئۆتۆمبیلێك ئاسان و سادە بێت.

بەڵێ، ئەوان ئەوەیان دەوێت: منیش پێم خۆشە ئەوەیان پێ بدەم. بۆ منیش و بۆ ئەوانیش ئاسانە، بەڵام شتێك هەیە ئەو کەسانە دەبێت بیزانن، ئەم جۆرە بنەما و ڕێسایانە یەك کێشەی بچووکیان هەیە و هیچی دی: هیچ سوودیان نییە. هەموو سروشتیبوون و تایبەتمەندییە خۆڕسکەکانی لەبار دەبەن، تام و چێژی قسەکانی بزر دەکەن. من باش ئەوە دەزانم. لە ڕابردوودا وزەیەکی زۆرم لەو بوارەدا بەکارهێناوە و کاتی زۆرم بە تاقیکردنەوەی ئەو جۆرە یاسا و بنەمایانەوە کوشتووە و زۆر جار تاقیم کردوونەتەوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە نابینیت نموونەی ئەو جۆرە یاسا و ڕێسایانە لەم کتێبەدا باسکرابێت، ئەمیش وەك ئەوەی جارێکیان جۆش بیلینگس وتی: "هیچ سوودێك لە زانینی ئەو شتانەدا نییە کە سوودیان نییە."

کەسێك هەیە بەناوی ئێدموند بێرك، ئەم کەسە هەندێك بابەتی ئەوەندە بەهێز و لۆژیکی لەسەر شێوازەکانی ووتاردان نووسیبوو کە تا ئێستاش لە زانکۆکاندا وانەی لەسەر دەخوێنرێت: کەچی بێرك خۆی وەك ووتاربێژێکی شکستخواردوو ناوبانگی دەرکردبوو. توانای نەبوو ئەو گەوهەرەی ناخی بخاتەڕوو، نەیتوانی قسەی سەرنجڕاکێش و کاریگەر بکات، بۆیە پێیان دەگووت "زەنگەکەی کۆشکی سپی." کاتێك هەڵدەستا قسە بکات، ئەندامانی دیکەی کۆشکی سپی دەکۆکین و بە فیڵ دەچوونە دەرەوە و خۆیان دەدزییەوە.

دەکرێت بە هەموو هێزێکتەوە گوللەیەکی پۆلایین بگریتە کەسێك و تەنانەت جلەکەیشی نەڕوکێت، بەڵام گەر مۆمێکی بچووك داگیرسێنیت دەتوانیت تەختەیەکی زۆر ئەستوور کون بکەیت. بەداخەوەم کە ئەوە دەڵێم؛ بەڵام ئەو قسانەی وەك مۆمێکی گڕگرتوون، کاریگەرییان زۆر لەو قسانە زیاترە کە وەك گوللەیەکی بێ هێز وایە و هیچ حەماس و کاریگەرییەکی تێدا نییە.

**پێنجەم/ ڕاهێنان لەسەر دەنگت بکە بۆ ئەوەی کاریگەر و گونجاو بێت**

کاتێك لەگەڵ کەسانی دیکەدا قسە دەکەین و بیرکردنەوە و بۆچوونەکانمان باس دەکەین، چەندین بەشی جەستە و دەنگەژێیەکانمان بەکاردەهێنین. شانمان هەڵدەتەکێنین، دەستمان دەجوڵێنین، برۆمان بەرز و نزم دەکەین، دەنگمان بەرز دەکەینەوە، ئاواز و بەرز و نزمیی بە دەنگمان دەدەین، هەروەها بەپێی بارودۆخەکە قسەکردنمان خێرا یان هێواش دەکەینەوە. پێویستە زۆر بەباشی ئەوەمان لەیاد بێت کە، هەموو ئەمانەی ڕوودەدەن ئەنجامن نەك هۆکار. ئەو گۆڕانکاری و جیاوازییەی لەدەنگماندا ڕوودەدات ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری مێشك و هەستەکانماندایە. هەر لەبەر ئەمەیە پێویستە بابەتێك هەڵبژێرین کە شارەزای بین و زۆر بەپەرۆشەوە باسی بکەین. هەر لەبەر ئەمەیە پێویستە زۆر تامەزرۆ بین و حەز بکەین ئەو بابەتە بۆ گوێگرەکانمان باس بکەین.

بەهۆی ئەوەی زۆربەمان کاتێك گەورە دەبین ئەو خۆڕسکی و سازگارییەی منداڵیمان لەدەست دەدەین، هەوڵدەدەین بچینە قاڵبێکی

دیاریکراوەوە و بەرگێکی تایبەت لە قسەکردن بکەین بە بەری خۆماندا، هەوڵدەدەین شێوەیەك بۆ خۆمان دروست بکەین. دەبینیت بەکەمی جوڵە و ئاماژەکانی دەستمان بەکاردەهێنین، بەدەگمەن دەنگمان بەرز و نزم پێ دەکەین. بەکورتی، سازگاری و خۆڕسکی لە گفتوگۆکانماندا نامێنێت و دەبینە کەسێکی جیاواز لە خۆمان. فێر دەبین یان زۆر بەهێواشی یان زۆر بەخێرایی قسە بکەین. دەبینیت شێوەیەکی تایبەت وەردەگرین و دەبێت بە خوویەك و ناتوانین بەدەر لەو شێوازە بە هیچ شێوەیەکی دیکە قسە بکەین. ئەگەر ئاگاداری خۆمان نەبین، لەدەست دەردەچین و کەڵکی قسەکردنێکی باشمان نابێت بۆ خەڵکی. لەم کتێبەدا بەردەوام داوات لێدەکرێت بەشێوەیەکی سروشتی ڕەفتار بکەیت. ڕەنگە بڵێیت: ئەگەر بەشێوەیەکی سروشتی و خۆڕسك قسە بکەیت، ووتارەکەیشت لاواز و بێتام بێت لێت خۆش دەبم. نەخێر بەپێچەوانەوە، من کاتێك دەڵێم پێویستە سروشتی بین لەو ڕووەوە دەیڵێم کە، بۆچوونەکانمان بەشێوەیەکی سروشتی دەربڕین و بە ڕۆحێتێکی بەرزەوە باسیان بکەین. بێگومان هیچ ووتاربێژێکی زیرەك پێی قەبوڵ نییە کەسێکی بێتوانا بێت و لەڕووی وشەسازی و شێوازی دەربڕینەوە ئاستێکی نزمی هەبێت و قسەکانی کاریگەر نەبن. نەخێر، کەسی زیرەك و لێهاتوو هەوڵ دەدات سروشتی و خۆڕسك بێت، لەولاشەوە زمانپاراو و کاریگەر بێت. هەرکەسێك حەز لە بەرەوپێشچوونی خۆی بکات، دەبێت هەوڵ بدات لەو ڕووانەوە بەرەوپێش بچێت.

ئیشێکی زۆر باشە گەر دەنگی خۆت تۆمار بکەیت و دواتر گوێی لێبگریتەوە بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێك بۆ ئاواز و بەرز و نزمی و خێرایی

دەنگت بکەیت. لەلایەکی دیکەوە، دەتوانیت بە هاوڕێکانت بڵێیت هەڵسەنگاندنت بۆ بکەن. خۆ ئەگەر پسپۆڕێك هەبێت لەو بوارەدا و ئەو هەڵسەنگاندنت بۆ بکات ئەوە زۆر باشترە. بەڵام پێویستە ئەوە لەیاد نەکرێت ئەم بابەتە شتێکە دوور لە چاوی بینەر و گوێگر تاقی دەکرێتەوە و ڕاهێنانی لەسەر دەکرێت، نەوەك لەبەردەم بینەر و گوێگردا. بۆیە کاتێك لەبەردەم گوێگردا دەتەوێت قسە بکەیت و دڵت لای ئەوەیە بە کام تەکنیك قسە بکەیت و چۆن ڕەفتار بکەیت، دەبینیت قسەکانت کاریگەرییان نامێنێت. کاتێك لەبەردەم گوێگردا دەوەستیت، بڕۆ نێو قوڵایی قسەکانتەوە، تەواوی بوونت کۆبکەرەوە و هەوڵ بدە کاریگەری لەسەر مێشك و هەست و سۆزی گوێگر دروست بکەیت، ئەوکات دەبینیت قسەکانت ئەوەندە سوور و کاریگەرن کە لە هیچ کتێبێکدا شتی وات نەبینیوە و دەستت ناکەوێت.

## پەختەی بەندی چوارەم

**هونەری گفتوگۆکردن**

## بەشی یانزەیەم: قسەکردن

یەکەم/ لە قەباخی خۆت وەرە دەرەوە

دووەم/ هەوڵ مەدە لاسایی کەسانی دیکە بکەیتەوە ـ خۆت بە

سێیەم/ لەگەڵ ئامادەبوواندا وتوێژ بکە

چوارەم/ دڵت ئاوێتەی قسەکانت بکە

پێنجەم/ ڕاهێنان لەسەر دەنگت بکە بۆ ئەوەی کاریگەر و گونجاو بێت

## Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن نوها کراوە بە pdf**
**پێشکەش بە خوێنەران کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

Invite Link

# بەندی پێنجەم



## ئاستەنگەکانی قسەکردن و ووتاردن بەشێوەیەکی کاریگەر

لەم بەندەدا هەموو ئەو تەکنیك و بنەمانەی لە ئەم کتێبە باسکراون دەیانبەستینەوە بە قسەی ڕۆژانەی خەڵکییەوە، لە گفتوگۆ کۆمەڵایەتییەکانەوە بیگرە تا دەگاتە ووتارێکی فەرمی، هەنگاو بە هەنگاو یاساکان دەبەستینەوە بە قسەی ڕۆژانەی خەڵکییەوە.

وای بۆ دەچین ئێستا بەدەر لە مەشقکردن، بتوانیت ووتار بۆ خەڵکی بدەیت. ئەو ووتارەش یەکێك لەم دوو شێوەیە دەبێت: یان ئەوەتا ووتارەکەت پێشەکییە بۆ ووتاری دوای خۆت، یان ئەوەتا ووتارێکی دورودرێژ و سەربەخۆیە. بەو هۆیەوە بەشێکمان تایبەت کردووە بە ئامادەکردنی ووتاری کورت و بەشێکی دیکەش تایبەتکراوە بە ئامادەکردنی ووتاری دوورودرێژ.

کۆتا بەشیش جەخت لەسەر سوودەکانی ئەو بنەمایانە دەکاتەوە کە بەدرێژایی ئەم کتێبە ڕوونکراونەتەوە، باس لە سوودی بەکارهێنانی ئەو تەکنیکانە دەکات لە ژیانی ڕۆژانە و گفتوگۆ کۆمەڵایەتییەکاندا.

## ((بەشی دوانزەیەم))
## ناساندنی ووتاربێژانی دیکە،
## پێشکەشکردن و وەرگرتنی دیاری و بەخشش

کاتێك داوات لێدەکەن قسە بۆ کۆمەڵێك کەس بکەیت، دەکرێت وەك پێشەکی بێت و ووتاربێژێکی دیکە بناسێنیت و بانگی بکەیت بۆ ووتاردان، یان خۆت بۆ یەکێك لەم مەبەستانە ووتارێکی دووردرێژ پێشکەش بکەیت: زانیاریی بە گوێگر بدەیت، خۆشحاڵیان بکەیت، قایلیان بکەیت، یان قایلیان بکەیت شتێك ئەنجام بدەن یان کارێك بکەن. ڕەنگە بەڕێوبەر یان ئەندامی ڕێکخراوێك بیت و بکەویتە ئەو بارودۆخەی کە لە کۆبوونەوەیەکدا تۆ هەڵبژێرن پێشەکییەکە دەستپێ بکەیت و کۆبوونەوە یان کۆنفرانسەکە بەڕێوە ببەیت، تۆ ئەو کەسە بیت کە پێویست بکات ووتاربێژ و قسەکەری دواتر بناسێنیت، وە یان ڕەنگە چاوەڕوان و تامەزرۆی ئەو کاتە بیت قسە بۆ کۆمەڵەکەی خۆت، کۆبوونەوەیەکی، گشتی، یان ڕێکخراوێکی سیاسی بکەیت. خەمت نەبێت، لە بەشی سیانزەیەمدا، هەندێك ئاماژە و ڕێنیشاندەرت پێدەدەم بۆ ئەوەی بتوانیت پێشەکی ئامادە بکەیت. هەروەها هەندێك شتی بەنرخت پێ دەڵێم لەسەر چۆنییەتی وەرگرتن و پێشکەشکردنی خەڵاتەکان. بەڵام ئێستا با باسی ئەوە بکەین چۆن بتوانیت سەرپەرشتیاری کۆڕ و کۆبوونەوەکان بکەیت و بۆنەکە بەڕێوە ببەیت، چۆن بەشێوەیەکی کارانە و لێزانانە ئەو کەسانە بناسێنیت و بانگیان بکەیت بۆ سەر ستەیج کە بڕیار وایە ووتار پێشکەش بکەن.

جۆن ماسن براون، نووسەر و ووتاربێژ، ئەو کەسەی کە ووتارەکانی لە هەموو کوچە و کۆڵان و شوێنێکی وڵاتدا کاریگەری لەسەر گوێگرەکانی دروستکردبوو، شەوێکیان لەگەڵ کەسێکدا قسەی دەکرد کە بڕیار وابوو هەستێت و پێشەکییەك بڵێت و جۆن ماسن بە ئامادەبووان بناسێنێت.

کابرا پێش ئەوەی هەستێت و دەستپێکی قسەکانی بکات، بە جۆن مانسنی گووت: "خەمی ئەو شتانەت نەبێت کە دەتەوێت بیڵێیت، هێور بە. من بڕوام بەوە نییە پێشوەخت قسە ئامادە بکەیت. ئامادەکاری کارێکی باش نییە، تام و چێژی قسەکانت ناهێڵێت، خۆشییەکانی لەباردەبات. من کاتێك دەوەستم قسەکانم بکەم تەنها چاوەڕێم ئیلهلمم بۆ بێت ـ هیچ کاتێکیش شکستم نەهێناوە و هەموو کات سەرکەوتوو بووم"

ئەم وشە دڵنیاکەرەوانە وای کرد بەڕێز جۆن مانسن بەپەرۆشەوە ئامادەبێت و ووتارەکەی بەبێ ترس پێشکەش بکات، لە کتێبەکەشیدا باس ئەم ڕووداوەی کردووە، بەڵام کاتێك کابرا هەستا جۆن مانسن بە هەمووان بناسێنێت و بانگی بکات بۆ سەر دوانگە، ئەمە ڕوویدا:

بەڕێزان، بێزەحمەت ئاگاتان لێرە بێت. ئەمشەو هەواڵێکی خراپمان پێیە بۆتان. ویستمان ئیسحاق ماراکۆسۆن بانگ بکەین قسەتان بۆ بکات، بەڵام نەخۆش بوو نەیتوانی بێت. (هەمووان چەپڵەیان لێدا.) دواتر داوامان لە سیناتۆر بلێدریج کرد قسەتان بۆ بکات. . . بەڵام سەرقاڵبوو بۆی نەکرا. (بوویە چەپڵەلێدان.) لەکۆتایدا ویستمان دکتۆر لۆلید گۆرگان بانگهێشت بکەین قسەتان بۆ بکات بێهودە بوو. (بوو بە چەپڵەلیدان.) بۆیە بەناچاری لەبری ئەوە بەڕێز جۆن مانسن براون قسەتان بۆ دەکات. (هەمووان بێدەنگ بوون.)

ئەمە لای خۆی قسەی کرد. جۆن مانسن باسی ئەو کارەساتە دەکات و بەگاڵتەکردنێکەوە دەڵێت: "هەرچەندە منی سووك کرد و بێنرخ پیشانی ئامادەبووانی دام، بەڵام هیچ نەبێت کابرای فەیلەسوف و قسەزان ناوەکەمی بەڕاستی گووت."

ئەو کابرای کە زۆر لە خۆی دڵنیابوو ئیلهامی بۆ دێت و دەتوانێت بەبێ ئامادەکاری قسە بکات، گەر ووتاریشی پێشکەش بکردایە لەوە خاپتر نەدەبوو. ئەو پێشەکییەی پێشکەشی کرد هیچ شارەزاییەکی پێوە دیار نەبوو. هەموو ڕەوشتێکی پیشەییانەی لەدەست دابوو، بەرانبەر قسەکەر و گوێگرەکانیش کارێکی هەڵەی کرد کە نەدەبوو بەوشێوە چاوەڕواننەکراوە شتەکان بشێوێنێت و لە کەسایەتی جۆن مانسن کەم بکاتەوە. ڕێکار و ڕەوشتە پیشەییەکان شتێکی ئەوەندە گەورە و گران نین، بەڵام زۆر گرنگن و دەبێت بپارێزرێن، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ڕێکخەرانی سیمینار و کۆبوونەوەکان کاتێك قسەکەر و بەشداربووان دەناسێنن، بێئاگان لەو ڕێکار و ڕەوشتە پیشەییانە.

ئەو قسانەی وەك پێشەکی لە سەرەتای کۆبوونەوە و کۆڕەکاندا دەکرێت و کەسێك بانگهێشت دەکەن قسە بکات، گرنگیەکی زۆریان هەیە. قسەکەر و گوێگر پێکەوە کۆدەکاتەوە، کەشێکی لەبار دەڕەخسێنێت، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی هەمووان بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ووتاربێژەکە بکەن. ئەو کەسەی کە دەڵێت، "لەسەر دوانگە پێویست ناکات زۆر قسە بکەیت، هەموو ئەوەی پێویستە تەنها ئەوەیە کەسی ووتاربێژ بناسێنیت و داوای لێ بکەیت بێتە سەر دوانگە و قسەکانی بکات." ئەو کەسە نەزانە و بە تۆمەتی نەزانی تاوانبارە. هیچ قسەیەك هێندەی ئەو قسانە تێکەڵ و

شێواو نین کە لە پێشەکیدا دەکرێن، ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت ئەو کەسانەی کۆبوونەوەکان بەڕێوە دەبەن بەگرنگی نەزانن.

دەبێت ئەو پێشەکییە بەجۆرێك بێت ئەوەندەمان لەسەر بابەتەکە پێ بڵێت کە وامان لێ بکات حەز لە باسکردنی بکەین. دەبێت هەندێك زانیاریمان لەسەر قسەکەر پێ بدات، کۆمەڵێك زانیاری بێت کە بۆمان ڕوون بکاتەوە ئەو کەسە شیاوی ئەوەیە لەسەر ئەو بابەتە قسە بکات. بەواتایەکی دیکە، دەبێت ئەو قسانەی لە پێشەکی و ناساندی سەرەتادا دەکرێن، بەجۆرێك بن بابەتەکە و خودی قسەکەرەکە بەلای گوێگرەوە سەرنجڕاکێش بکەن. ئەمەش دەبێت لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەنجام بدرێت.

ئەوەی پێویستە پێشەکی بیکات ئەمەبوو. بەڵام ئایا لەڕاستیدا پێشەکی و دەستپێك لە کۆبوونەوە و ئاهەنگەکاندا ئەو کارە دەکات؟ ٩٠٪ نەخێر نایکات ـ بەدنیاییەوە نەخێر. زۆربەی پێشەکییەکان لاواز و بێسوودن، نابێت بەوشێوەیە بن. ئەگەر ئەو کەسەی پیشەکیەکە پێشکەش دەکات بزانێت قسەکانی چەند گرنگن و بەشێوەیەکی دروست قسەکانی بکات، ئەوکات دەبوو بە کەسێك کە بۆ هەموو ئاهەنگ و بۆنەکان بانگ دەکرا و داوای لێدەکرا بۆنە و ئاهەنگەکان بەڕێوە ببات.

ئەمانەش هەندێك پێشنیار و ڕێنیشاندەرن کە هاوکاریت دەکەن پێشەکییەکی ڕێکوپێك ئامادە بکەیت.

**یەکەم/ ئەوەی دەتەوێت بیڵێیت بەوردی ئامادەی بکە**

هەرچەندە قسەی پێشەکی کورتە، بەدەگمەن لە یەك خولەك زیاترە، بەڵام پێویستی بەوەیە وریابیت لە ئامادەکاردنیدا. یەکەم، دەبێت زانیارییەکانت کۆبکەیتەوە، زانیارییەکانیشت لەدەوری ئەم سێ بابەتەدا خۆی دەبینێتەوە: ئەو بابەتەی قسەکەر باسی دەکات، کارامەیی و پسپۆڕیی کەسی ووتاربێژ، هەروەها ناوی قسەکەر. زۆر جار خاڵی چوارەمیش دێتەگۆڕ: بۆچی ووتاربێژ ئەو بابەتەی هەڵبژاردووە، کە ئەمەش بەلای گوێگرەوە جێگەی بایەخە.

دڵنیابە لەوەی بەباشی ناونیشانی بابەتەکە دەزانیت و ئاستی شارەزایی و کارامەیی ووتاربێژەکەش دەزانیت. بەنیسبەت ووتاربیژەوە هیچ شتێك لەوە شەرمەزارکەرتر و ناخۆشتر نییە کاتێك هڵدەستێت قسەکانی بکات، زانیارییەك یان قسەیەکی کەسی پێشکەشکار ڕاست بکاتەوە. دەتوانیت خۆت لە حاڵەتی لەو شێوەیە بپارێزیت، ئەمیش بەوەی بەتەواوی دڵنیابیتەوە لەو بابەتەی ووتاربێژەکە قسەی لەسەر دەکات، هەروەها لەخۆتەوە لێکدانەوە و پێشبینی بۆ ئەو شتانە نەکەیت کە کابرای قسەکەر دەیەوێت بیڵێت. ئەرکی تۆ وەك پێشکەشکارێك ئەوەیە کە ناونیشانەکە بەدروستی بڵێیت و بیبەستیتەوە بە گوێگرەوە. ئەگەر کرا هەموو ئەو زانیارییانە لە خوودی قسەکەرەکە خۆیەوە بەدەست بهێنە. یان دەکرێت هەموو زانیارییەکان لەسەر پەڕەیەك بنووسیت و لەگەڵ ووتاربێژەکەدا سەیری بکەن و دڵنیای بکەنەوە نەوەك هەڵەیەکت کردبێت.

ڕەنگە زۆربەی ئەو زانیارییانەی ئامادەی دەکەیت تایبەت بێت بە خوودی قسەکەر و شارەزایی و کارامەییەکانییەوە. لە هەندێ حاڵەتدا دەتوانیت کەسەکە بناسێنیت کێیە و کارەکانی چین. بەڵام دواجار هەرچییەك بێت پێویستە ئەو زانیارییانەی کۆیاندەکەیتەوە ڕاست و دروست بن. هەروەها ئاماژە بە بڕوانامە و پێگەی ئەو کەسە بکە. بە نموونە، کەسەکە سەرەتا مامۆستا بووە و دواتر بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرای بەدەستهێناوە، پێویست ناکات بە مامۆستا بانگی بکەیت، باشتر وایە بە کۆتا بڕوانامەوە ناوی بهێنیت کە ئەویش دکتۆرە. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ بدە دەستکەوتەکانی باس بکەیت.

بە نموونە، گوێم لێبوو پێشکەشکارێکی بەناوبانگ شاعیرێکی ئیرلەندی ناساند بە ئامادەبووان. ئەویش ویلیام بەتلەر یەیتس بوو. ویلیام بۆ ئەوە هاتبوو هەندێك هۆنراوەی خۆی بخوێنێتەوە. شایەنی باسە سێ ساڵ پێش ئەو ئاهەنگە، ویلیام لەبواری ئەدەبیاتدا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبوو، ئەوەش بەنرخترین خەلاتە نووسەر و شاعیران بتوانن بەدەستی بهێنن. دڵنیام ١٠٪ی ئەوانەی لەوێ بوون نەیاندەزانی گرنگی ئەو خەڵاتە چییە. بۆیە پێویستبوو باس لە گرنگیی ئەو خەڵاتە بکرێت و ئاماژە بەوەش بکرێت ئەم شاعیرە توانیویەتی ئەو خەڵاتە بەدەست بهێنێت. ئەگەر هیچ نەوترێن پێویستە باسی ئەو خەڵاتە هەر بکرێت. بەڵام پێشەشکارەکە چیکرد؟ بەتەواوی هەموو ئەو زانیاریانەی پشتگوێ خست، باسی ئەفسانە و خەیاڵات و هۆنراوە یۆنانییەکانی دەکرد.

**دووەم/ شوێن ڕێسای نـ - گـ - قـ بکەوە**

لەزۆربەی ناساندن و پێشەکییەکاندا، ڕێسای ن - گ - ق وەك ڕێبەرییەك وایە کە دەتوانیت بەهۆیەوە زانیارییەکانت ڕێك بخەیت:

١. **نـ** : واتە ناونیشان. کاتێك دەست دەکەیت بە قسەکردن، ناونیشانی تەواوەتی بابەتەکە بڵێ.

٢. **گـ** : واتە گرنگی بابەتەکە. لەم قۆناغەدا پردێك لەنێوان ناونیشانەکە و ئارەزووی گوێگرەکاندا درووست بکە.

٣. **قـ** : واتە قسەکەر. لێرەدا دیارترین تایبەتمەندی و تواناکانی قسەکەر دەنووسیت، بەتایبەت ئەوانەی تایبەتن بەو ناونیشان و بابەتەی قسەی لەسەر دەکات. لەکۆتایدا بەڕوونی و بەڕاشکاوی ناوەکەی دەڵێیت و بانگی دەکەیت بۆئەوەی بفەمووێت قسەکانی بکات.

لەم ڕێسایەدا بوارێکی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بەدڵی خۆت زانیارییەکانت بەکار بهێنیت. پێویست ناکات ناونیشانەکە هەڵکوڕزێنیت و پەلەی لێ بکەیت. ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە کە لەسەر ئەو ڕێسایە ڕۆشتووە. هۆمەر سۆرن سەرنووسەری ڕۆژنامەی نیویۆرك بەم شێوەیە جیۆرج وێڵباوم، سەرۆکی کۆمپانیایەکی موبایلی بە کۆمەڵێك ڕۆژنامەوان ناساند: ناونیشانی قسەکەرەکەمان بریتییە لە، "موبایل خزمەتی تۆ دەکات." بەنیسبەت منەوە یەکێك سەیرترین شتەکانی دونیا ئەوەیە کاتێك تەلەفوون دەکەیت چۆن تەلەفوونەکە دەڕوات و چی ڕوودەدات و پرۆسەکە چۆنە. بۆچی ژمارەی هەڵەت بۆ دێت؟ بۆچی هەندێ جار پەیوەندی دەکەیت بە شارێکی دوورەوە کێشەی نییە و شەبەکەی هەیە، بەڵام کاتێك پەیوەندی بە شوێنێکی زۆر نزیکەوە دەکەیت شەبەکە نییە؟

قسەکەرەکەمان وەڵامی هەموو ئەمانە و پرسیارەکانی دیکەی تایبەت بە تەلەفوونی لایە. بۆ ماوەی بیست ساڵە ئیشی ئەوەیە هەموو وردەکاری و زانیارییەکانی تایبەت بە موبایل بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە. ئەو بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی تەلەفوونییە و بەمانای وشە پسپۆڕە.

ئەو ئێستا باسی خزمەتگوزارییەکانی کۆمپانیاکەی دەکات. ئەگەر ئێوە ئەمڕۆ خزمەتگوزاریی کۆمپانیاکەیتان بەدڵە، ئەوە بیکەن بە وەکیل و ڕێنیشاندەری خۆتان. خۆ ئەگەر بێزاربوون بەدەست موبایلەکانتانەوە، ئەوە بیکەن بە داکۆکیکاری خۆتان و سکاڵاکانتان بهێنن بۆ لای.

بەڕێزان، ئامادەبووان، ئێستاش بەڕێز جیۆرج وێلبووم سەرۆکی کۆمپانیای موبایلی نیویۆرك قسە دەکات، تکایە با بفەرمووێت.

سەرنج بدە چەندە ژیرانە ئەو پێشکەشکارە وای کرد ئامادەبووان بیر لە موبایل بکەنەوە. بەهۆی هەندێ پرسیارەوە وای کرد زیاتر تامەزۆربن و دواتریش ئاماژەی بەوە دا کە قسەکەرەکە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەزانێت، هەرپرسیارێکی دیکەشیان هەبێت وەڵامی دەداتەوە.

گومان دەکەم ئەو پێشەکییە نووسرابێتەوە یان لەبەرکرابێت، زۆر سروشتی و سەرنجڕاکێش بوو. لەبەر ئەوە هەرگیز نابێت پێشەکی لەبە بکرێت.

## سێیەم/ بەپەرۆش بە

لە پێشەکی و ناساندنی ووتاربێژدا، ڕەفتار هێندەی گوفتار گرنگە. پێویستە ڕووت خۆش بێت، لەبری ئەوەی بڵێیت زۆر دڵخۆشم، هەر بەڕاسی دڵخۆش بە کە قسەکانت دەکەیت. ئەگەر بە هەستێکی قووڵەوە

قسە بکەیت و بابەتەکە تەواو گەرموگوڕ بکەیتەوە، دەبینیت هەموان تامەزرۆتر دەبن و زیاتر چەپڵەڕێزانی کەسی قسەکەر دەکەن. ئەم گەرموگوڕییەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی ووتاربێژ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدات و باشترین ئاست پێشکەش بکات.

کاتێك لەکۆتایی ناساندنەکەتدا ناوی کەسی قسەکەر دەبەیت، باشتر وایە ئەم وشانەت لەبیر بێت: *وەستان*، *جیاکردنەوە*، هەروەها **هێز**. مەبەست لە ***وەستان*** ئەوەیە کە تۆزێك پێش ئەوەی ناوەکە ببەیت کەمێك بووەستیت بۆ ئەوەی هەموان تامەزرۆبن. مەبەست لە ***جیاکردنەوە*** ئەوەیە کە ناوی کەسەکە لەگەڵ ناوی باوکی جیا بکەیتەوە، یان ناوی خۆی و بڕوانامەکەی، وەك: دکتۆۆۆر___ کەمێك وەستان____ فلان. بەو شێوەیە گوێگر زیاتر سەرنجی دەچێتە سەر ناوی کەسەکە. مەبەست لە **هێزیش** ئەوەیە کە بە توندی ناوەکە ببەیت و دەنگت بەرز بکەیتەوە.

یەك ئاگاداری دیکە: تکات لێدەکەم کاتێك ناوی قسەکەرەکە دەڵێیت، ڕوو مەکە کەسەکە خۆی، تەماشای گوێگرەکان بکە تا دەگەیت بە کۆتا بڕگەی ناوەکەی: کە گەشتیت بە کۆتایی ناوەکە ئەنجا ڕوو بکە کەسی قسەکەر. زۆرێك لەو کەسانەم بینیوە کە کۆبوونەوە و ئاهەنگەکان بەڕێوەدەبەن، پێشەکییەکی جوانیان پێشکەش کردووە بەڵام لە کۆتاییدا تێکیان داوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کاتێك ناوی کەسەکەیان بردووە ڕوویان کردووەتە خۆی و ناوەکەیان بۆ خۆی خوێندووەتەوە و هەموو ئامادەبووانیان پشتگوێ خستووە.

**چوارەم/ زۆر گەرموگوڕ و دڵسۆز بە**

لەکۆتاییدا، هەوڵ بدە دڵسۆز و گەرموگوڕ بیت. دوور بکەوەرەوە لە ووتەی زبر و ڕەخنەئامێز یان گاڵتە و گەپی نابەجێ. ئەو جۆرە پێشەکییانەی کە گاڵتە و قسەی نەشیاوی تێدایە جۆرێك لە لێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکرێت لەلایەن ئامادەبووانەوە. تۆ لە شوێنێکی کۆمەڵایەتیدایت و کەسێکی زۆر گوێیان لە تۆ گرتووە، بۆیە هەوڵ بدە ڕاستگۆ و دڵسۆز و گەرموگوڕ بیت. ڕەنگە لەگەڵ ووتاربێژەکەدا ناسراو و دۆست بن، بەڵام گوێگر وا نییە، لەبەر ئەوە ڕەنگە بە هەڵە لەو قسانە تێبگەن کە لەنێوان خۆتاندا بە ئاسایی دەزانن.

**پێنجەم/ بەوردی ئەو قسانە ئامادە بکە کە لە ناساندن و دەستپێکدا دەیانڵێیت**

"ئەوە سەلمێنراوە کە مرۆڤ زۆر حەزی لە ناوبانگ و ناسراوێتییە - حەزی لە ڕێز و شکۆیە!" ئەمە قسەی خانمە نووسەر مارگەری ویڵسنە. ویڵسن باس لەو هەستە جیهانییە دەکات: ئێمە هەموومان حەزدەکەین لە ژیاندا سەرکەوتوو بین، دەمانەوێت نرخمان بزانن. ئەگەر تەنها بە وشەیەکیش بێت پاداشتی کەسێك بکەین، دەبینیت بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر ڕۆحێت و کەسایەتی بەرز دەکەینەوە.

کاتێك پێشەکییەك باس دەکەین، ئەوە بە هەمووان دەڵێین کە: ئەو کەسە گرنگی و نرخی خۆی هەیە، کەسێکە لە بوارێکی تایبەتدا سەرکەوتوو بووە، شایستەی ڕێز و پاداشتە، ئێمەش بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە کە ئەو

پاداشت و ڕێزەی پێببەخشین. ئەوەی لەو کاتەدا دەیڵێین پێویستە کورت و پوخت بێت، هەروەها دەبێت بەباشی بیرمان لێکردبێتەوە وریابین لە وتنیدا. ڕەنگە ئەو قسە و خەڵات و ڕێزلێنانە بەلای ئەو کەسانەوە زۆر گرنگ نەبێت کە پێشتر خەڵاتی ڕێزلێنان و سوپاسنامەیان وەرگرتووە، بەڵام دەکرێت بەلای کەسانی خوارترەوە شتێك بێت تا مردن لەبیری نەکەن. لەبەر ئەوە پێویستە بەوریاییەوە وشەکانمان هەڵبژێرین و بزانین چۆن ستایش یان خەڵاتی کەسێك دەکەین. بۆ ئەم مەبەستەش هەندێك بنەمای زۆر بەسوود هەیە:

١. باسی ئەوە بکە بۆچی ئەو خەڵاتە ئامادەکراوە. دەکرێت بۆ خزمەتی زۆری کەسەکە بێت، بۆ بردنەوەی پێشبڕکێیەك بێت، یان بۆ دەستکەوتێکی تایبەتی بێت. بەکورتی و بەپوختی ئەوە ڕوون بکەرەوە.

٢. شتێکی ژیانی ئەو کەسە باس بکە کە خەڵاتەکە وەردەگرێت - شتێك بێت کە جێگەی بایەخی ئامادەبووان بێت.

٣. باس لەوە بکە ئەو کەسە چەندە شایەنی ئەو خەڵاتەیە و ئاماژە بەوەش بکە ئامادەبووانیش هەمان هەستیان هەیە.

٤. پیرۆزبایی لە وەرگری خەڵاتەکە بکە و پێی بڵێ ئامادەبووانیش هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازن.

هیچ شتێك لە پێشەکی و ناساندندا هێندەی خەمخۆری و دڵسۆزی گرینگ نییە. بەبێ ئەوەی خۆشت هیچ بڵێیت هەمووان هەست بەوە دەکەن. نابێت لەکاتی سوپاس و باسکردنی کەسەکەدا زیادەڕەوی بکەیت، چونکە لەو کاتانەدا گەر وریا نەبیت ڕەنگە بەئاسانی پیاهەڵدان و پێوەنان بۆ ئاست و توانای ڕاستەقسنەی کەسێك بکەیت. ئەگەر کەسەکە شایستەی

خەڵاتەکە بوو، پێویستە باسی بکەین، بەڵام نابێت وشەی زیاد لە پێویست بڵێین. کاتێك زیاد لەپێویست ستایشی ئەو کەسە دەکەیت، ئەوکات خوودی کەسەکە ئاسوودە نابێت و ئامادەبووانیش باش دەزانن کە وا نییە و بڕوا بە قسەکانت ناکەن.

هەروەها نابێت خەڵاتەکە زیاد لە پێویست گەورە بکەین. لەبری ئەوەی زیاتر سەرنج بخەینە سەر گرنگیی خەڵاتەکە، پێویستە باس لەو هەست و خۆشەویستییە بکەین کە بەخشەرانی ئەو خەڵاتە بۆ ئەو کەسەیان هەیە.

## شەشەم/ کاتێك خەڵات وەردەگریت، هەستی سوپاسگوزاریت دەربڕە

ئێستا تۆ بوویت بەو کەسەی خەڵاتەکە وەردەگریت. گەر لە بۆنیەیك یان شوێنێك خەڵاتیان پێ بەخشیت، پێویستە چەند قسەیەکی زۆر بەپێز بکەیت، دەبێت لە پێشەکی کورتتر بێت. نابێت شتێك بێت لەبەرمان کردبێت: بەڵام گەر پێشتر ئامادەکاری بکەیت باشترە. ئەگەر زانیمان خەڵاتێکمان پێشکەش دەکەن، پێویست ناکات بۆ وشە دامێنین و نەتوانین سوپاسی بەرانبەر بکەین.

نابێت بەتەنها بڵێیت: "سوپاس، ئەمە خۆشترین ڕۆژی ژیانمە، جوانترین شتە بۆ من." شتێکی باش نییە بەو شێوەیە قسە بکەیت. وەك چۆن لە پێشەکیدا پێوەنان و زیادەڕەوی هەبوو، لێرەشدا دەکرێت تووشی ئەو کێشەیە ببیتەوە. وشەی "خۆشترین ڕۆژ" لەگەڵ "جوانترین شت" هەردووکیان جۆرێکن لە گەورەکردنی بابەتەکە زیاد لە قەبارەی خۆی. دەتوانیت وشەی سادەتر بەکاربهێنیت بەڵام لەدڵەوە دەربچن. ئەمانەش هەندێك ڕێنیشاندەرن کە دەتوانیت بەکاریان بهێنیت:

١. بەگەرموگوڕی سوپاسی هەمووان بکە.

٢. سوپاسی هەموو ئەوانەش بکە کە هاوکارییان کردوویت، هاوڕێکانت، خێزانەکەت، فەرمانبەرەکانت (گەر خاوەن کۆمپانیای)، یان خاوەن کارەکەت (گەر لە کۆمپانیایەکدایت).

٣. ئاماژە بەوە بدە کە تا چەند ئەو خەڵاتە بەلاوە گرنگە. بیکەرەوە و پیشانی هەمووانی بدە. بە هەمووان بڵێ چەندە جوان و دڵگیرە و دڵنیایان بکەرەوە کە بەکاری دەهێنیت (ئەگەر بۆ بەکارهێنان بوو).

٤. بە سوپاسێکی دیکە کۆتایی بە قسەکانت بهێنە.

لەم بەشەدا باسمان لە سێ جۆر قسەکردن کرد: پێشەکی، بەخشینی خەڵات بە کەسێکی دیکە، هەروەها وەرگرتنی خەڵات. دەکرێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ئیشەکەتدا یان لەو ڕیکخراوەی ئیشی تێدا دەکەیت تووشی ئەم حاڵەتانە ببیتەوە و داوای یەکێك لەو سێ جۆرەت لێ بکەن.
بۆیە داوات لێ دەکەم هەرکاتێك تووشی یەکێك لەو سێ جۆرەت بوویتەوە، شوێن ئەم ڕێنمییانە بکەویت بۆ ئەوەی ئاسوودەبیت و ترست لەهیچ نبێت.

## ((بەشی سیانزەیەم))

## ئامادەکردنی ووتاری دووردرێژ

---

هیچ پیاوێکی ژیر بێبەرنامە دەست ناکات بە دروستکردنی خانوو: ئەی بۆچی دەستدەکات بە ووتاردان بەبێ ئەوەی بزانێت دەیەوێت چی بگەیەنێت بە بەرانبەر؟ قسەکردن جۆرێکە لە گەشتکردن بە مەبەستێکی دیاریکراوەوە، لەبەر ئەوە پێویستە و دەبێت بەرنامەڕێژیی بۆ بکرێت. ئەو کەسەی بەبێ هیچ ئامانجێك دەستپێدەکات، دەگات بەهیچ.

ناپلیۆن دەڵێت: هونەری جەنگ زانستێکە هیچ شتێك تیایدا سەرکەوتوو نابێت ئەگەر بەباشی لێکدانەوەی بۆ نەکرێت و بیری لێ نەکرێتەوە." چۆن ئەمە لە شەڕ و تەقەکردندا ڕاستە بەهەمان شێوە لە قسەکردنیشدا وایە. بەڵام ئایا ووتاربێژان و قسەکەران ئەوە دەزانن ـــ یان ئەگەر بیشزانن، ئایا هەموو کاتێك پیادەی دەکەن؟ نەخێر. هەندێ ووتار و قسە هەیە هێندەی مەنجەڵێك چێشتی مجەور ڕێکخستن و بەرنامەڕێژی پێوە دیار نییە.

ئایا باشترین و کاریگەرترین شێواز چییە بۆ ئەوەی بتوانین بەهۆیەوە کۆمەڵێك بیرۆکە و بۆچوون ڕێك بخەیت؟ دڵنیام هیچ کەسێك نازانێت جگە لەوانەی خوێندوویانە. هەموو ووتاربێژ و قسەکەرێك بەردەوام تووشی ئەو کێشە دەبێت، بۆیە دەبێت بگەڕێت و بپرسێت. کەس ناتوانێ هەندێك یاسای بێ کەموکورتی دابنێ: بەڵام ئێمە تا ڕادەیەك دەتوانین ئاماژە بە سێ قۆناغە سەرەکییەکەی قسەکردن بکەین: قۆناغی سەرنجڕاکێشان،

ناوەڕۆک، دەرەنجام و کۆتایی. بۆ هەر یەکێك لەم قۆناغانە چەند ڕێگایەك هەیە کە دەتوانیت بەهۆیەوە پەرە بەو قۆناغانە بدەیت. ئێستاش باس لە هەر سێ قۆناغەکە دەکەین و ڕێگاکانی بەهێزکردنیشیان دەخەینەڕوو:

**یەکەم/ دەستەبجێ سەرنجی گوێگر بۆ خۆت ڕابکێشە**

جارێکییان پرسیارم کرد لە دکتۆر لین هارۆڵد سەرۆکی پێشووی زانکۆی نەرویج، گرنگترین زانیاری چییە کە ئەزموونی ووتاربێژی فێری کردوویت. دوای کەمێك وەستان وتی: "پێشەکییەکی سەرنجڕاکێشت هەبێت، بەجۆرێك بێت بەزوویی سەرنجی هەمووان ڕاکێشێت." ئەو قسەیەی کرۆکی هەموو بابەتەکی خستەڕوو. ئایا چۆن وا بکەین لە یەکەم وشەمانەوە گوێگر تامەزرۆی خۆمان بکەین؟ چەند ڕێگا و میتۆدێك هەن، کە ئەگەر پیادە بکرێن، گرنگییەکی زۆر دەدەن بە دەستپێکی ووتارەکەت.

**بە نموونەیەکی واقیعی دەست پێ بکە**

لۆوێڵ تۆماس، کە بە شیکاری سیاسی و ووتاربێژێکی جیهانی ناوبانگی دەرکردبوو، لە یەکێك لە ووتارەکانیدا کە لە یەکێك لە وڵاتە عەرەبییەکان پێشکەشی کرد، بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

ڕۆژێکیان لە شەقامێکی مەسیحییەکانی شاری قودس بووم، وێنەی پیاوێکم بینی جلێکی زۆر جوانی لەبەردابوو کە لەشێوەی پاشا

ڕۆژهەڵاتییەکاندا بوو. لەتەنیشتییەوە شمشێرێك هەڵواسرابوو کە هی ئالوبەیتی پێغەمبەر محەممە بوو (درودی خوای لەسەر بێت). . . .

بە باسکردنی چیرۆکێك کە خۆی ئەزموونی کردووە تەواو سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا. ئەو جۆرە دەستپێکانە بەدەگمەن شکست دەهێنن. ئێمە هەمووومان بەسەرنجەوە گوێ لەو جۆرە قسانە دەگرین، چونکە خۆمان بە بەشێك لەو ڕووداوە دەزانین و حەزدەکەین بزانین چی ڕوودەدات. ڕێگایەکی دیکە دەزانم لە باسکردنی چیرۆك کاریگەرتر و بەهێزترە.

یەکێك لە ووتارەکانم کە چەندین جار پێشکەشم کردووە، بەو وشانە دەستپێدەکات:

تازە بە تازە زانکۆم تەواو کردبوو، شەوێکیان لە ویلایەتی داکۆتا بە شەقامێکدا دەڕۆشتم، پیاوێکم بینی لەسەر سندوقێك وەستابوو قسەی بۆ کۆمەڵێك کەس دەکرد. زۆر حەزمکرد بزانم بابەتەکە چییە، بۆیە چوومە ناویانەوە و گوێم بۆ گرتن، کەسی قسەکەر دەیگووت: "ئایا ئەوە دەزانیت کە هیچ کات کەسێکی هیندی نابینیت کەچەڵ بێت؟ یان هەرگیز ئافرەتێکی هیندی نابینیت قژی ڕووتابێتەوە؟ با من پێتان بڵێیم بۆ وایە..."

هیچ خاوەخاوی نەکرد و درێژەی بە قسەکانی نەدا، ڕاستەوخۆ کرۆکی بابەتەکەی ووژاند. بەڵێ، تۆش بەباسکردنی ڕووداوەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەتوانیت ئاسانتر سەرنجی گوێگر ڕاکێشیت. ئەو قسەکەرەی

کە بە نموونەیەکی ژیانی خۆی دەستپێدەکات لە پێگەیەکی سەلامەتدا وەستاوە، لەبەر ئەوەی بیر لە وشە ناکاتەوە، بیرۆکەی لێ نابڕێت.

## گوێگر تامەزرۆی ڕووداوەکانی دواتر بکە

پاوڵ هیلی لە فیلەدێلفیا ووتارێکی پێشکەش کرد و بەم شێوەیە دەستی کرد بە قسەکردن:

٨٢ ساڵ لەمەوبەر، لە شاری لەندەن چیرۆکێکی کورت بڵاوکرایەوە کە دواتر لەناو خەڵکیدا بۆ هەمیشە بەزیندوویی مایەوە. زۆربەی خەڵك ناویان لێ نابوو "گەورەترین کورتە کتێبی جیهان." یەکەم جار کە چاپکرا و بڵاوبوویەوە، خەڵکی ناوچە جیاجیاکاندا کە بەیەك دەگەشتن لە یەکتریان دەپرسی، "ئایا ئەو چیرۆکەت خوێندووەتەوە؟" زۆربەی زۆری خەڵك دەیگووت، "ئەرێوەڵا خوێندومەتەوە، خوای گەورە لێی خۆش بێت."
ئەو ڕۆژەی ئەو کورتە کتێبە بڵاوکرایەوە هەزارانە دانەی لێ فرۆشرا. لەماوەی دوو هەفتەدا پانزە هەزاری لێ فرۆشرا. لەو کاتەوە تا ئێستا هەزارەها دانەی لێفرۆشراوە و بۆ هەموو زمانەکانی دونیا وەرگێڕدراوە. چەند ساڵێکی کەم لەمەو پێش، جۆن پیرپۆنت مۆرگان بە پارەیەکی خەیاڵی نوسخە ئەسڵییەکەی کڕی و لە گەنجینە بەنرخەکەیدا هەڵیگرتووە. دەزانن ئەو کتێبە کامەیە؟ کتێبی...

ئایا سەرنجی تۆیشی ڕاکێشا؟ ئایا تامەزرۆی زیاتر بزانیت لەسەر ئەو کتێبە؟ ئایا هەست ناکەیت کەسی قسەکەر سەرنجی گوێگرەکانی

ڕاکێشاوە؟ دەزانیت بۆچی بەو شێوەیە سەرنجی ڕاکێشایت؟ لەبەر ئەوەی وای لێکردیت حەزت لە چیرۆکەکە بێت و بتەوێت زیاتر بزانیت. حەز؟ جا کێ حەزی نەدەکرد زیاتر بزانێت؟

ڕەنگە تۆ زۆر حەزت لێ کردبێت! ئێستا دەپرسیت ئەو نووسەرە کێ بوو، ئەو کتێبە ناوی چی بوو؟ بۆ ئەوەی ئەو تامەزرۆییەت بڕەوێتەوە، ئەمە وەڵامەکەیە: نووسەرەکە ناوی چارلس دیکنس بوو، کتێبەکەش ناوی "سروودی کریسمس" بوو.

تامەزرۆکردنی گوێگر ڕێگایەکی زۆر سەرکەوتووە بۆ ڕاکێشانی گوێگر بەلای خۆتدا. جارێکیان سیمینارێکم پێشکەش کرد لەسەر، "چۆن واز لە نیگەرانیەکان بهێنین و دەست بە ژیان بکەین،" لەو سیمینارەمدا بەم شێوەیە هەوڵمدا گوێگرەکانم تامەزرۆی قسەکانم بکەم و سەرنجیان ڕابکێشم: لە بەهاری ١٨٧١دا، پیاوێك کە دواتر بوو بە فیزیازانێکی بەناوبانگ، ویلیام ئۆسلەر، کتێبێکی هەڵگرت و ٢١ وشەی لێ خوێندەوە، ئەو وشانە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر داهاتووی دروست کرد. بەهۆی ئەو وشانەوە ئەو پیاوە بەتەواوەتی گۆڕا، بەجۆرێك هیچ لەو کەسەی پێشتر ناچێت."

ئایا ئەو ٢١ وشەیە چی بوون؟ ئایا چۆن ئەو وشانە کاریگەرییان لەسەر داهاتووی دروستکرد؟ ئەمە ئەو پرسیارانەیە کە گوێگر حەزدەکات وەڵامەکانیان بزانێت.

## زانیارییەکی سەرنجڕاکێش بڵێ

کلیفۆرد ئادەم، بەڕێوبەری بەشی ڕاوێژکاری و هاوسەرگیری زانکۆی پەنسیلڤانیا، لە ڕۆژنامەیەکدا بابەتێکی بە ناونیشانی "چۆن هاودەمێك هەڵبژێریت" بڵاکردەوە و بە کۆمەڵێك زانیارییەوە دەستی پێکرد[٨]. کۆمەڵێك زانیاریانەی کە بە بیستنی هەناسەت سوار دەبێت، ئەو زانیاریانەی دەستپێکی بابەتەکە دەڕازێنێتەوە:

لەمڕۆدا گەنجان کەمتر بەهۆی هاوسەرگیرییەوە خۆشبەختی دەدۆزنەوە. ڕێژەی تەڵاق زۆر مەترسیدارە. لە ساڵانی ١٩٤٠ بۆ ١٩٤٦ لە هەر پێنج یان شەش زەواجێکدا یەکێکیان شکستی هێناوە و جیابوونەتەوە. پێشبینی دەکرێت ئەو ڕێژەیە ببێت بە یەك لەسەر چوار. ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بێت، لە چەنجا ساڵی داهاتوودا ڕێژەکە تەواو بەرز دەبێتەوە لە هەر دوو هاوسەرگیرییەك، یەکێکیان بە جیابوونەوە کۆتایی دێت.

لە واشنتن یەکێك لە خوێندکارەکانمان بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر ئەم ڕێگایەی بەکارهێنا - وروژاندنی حەزی گوێگر. ئەم خوێندکارە ناوی مێگ شیلێ بوو. بەو شێوەیە دەستپێکی قسەکانی کرد:

"ماوەی ١٠ ساڵ زیندینی بووم. بەڵام لە زیندانێکی ئاسایی نا، بەڵکوو ئەو زیندانانەی کە دیوارەکانی ترس و نیگەرانی بوون لە هەستی خۆبەکەمزنی، شیشی دەرگاکانیشی بریتیبوون لە ترس لە ڕەخنە."

---

٨ - لەو کاتەدا بەشێك هەبووە تایبەت بووە بە پرۆسەی هاوسەرگیری خوێندکاران، جیا لە بڕوانامە خوێندکاران توانیویانە بەهۆی ڕێنمایی و ئاسانکاریەکانی ئەو بەشەوە ئاسانتر هاوسەرگیری بکەن - وەرگێڕ.

ئایا ناتانەوێت زیاتر لەسەر ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەیە بزانن؟ ئاگات لێبوو قسەکەر چۆن گوێگری تامەزرۆ کرد؟ بەڵام پێویستە شتێکت لەیاد بێت: نابێت پێشەکی زۆر ترسێنەر بێت، واتە زۆر خەماوی یان زۆر هەستیار نەبێت. لەبیرمە کاتی خۆی ووتاربێژێك کە دەستیکرد بە قسە، یەك گوولەی کرد بە ئاسماندا، دەستبەجێ هەمووان سەرنجیان دا، بەڵام سوودی چیە خۆ پەردەی گوێی گوێگرەکانی تەقاند و زیڕەی پێ کردن.
بەشێوەیەکی شیاو دەست بە قسەکانت بکە. بۆ ئەوەی بزانیت دەستپێکی قسەکانت شیاوە، لەناو کۆمەڵێك کەسی خۆتدا تاقی بکەرەوە، ئەگەر لەوێ نەگونجاو هاتە پێش چاو و بەدڵیان نەبوو. پێناچێت گوێگر و ئامادەبووانی کۆڕەکەش بەدڵیان بێت.
زۆرجار بەشێکی ناڕوون و ئاڵۆزی ووتارەکە جێگەی بایەخی گوێگرە. بە نموونە، بەم دواییانە گوێم لێبوو ووتاربێژێك بەم شێوەیە دەستی پێکرد: " متمانەت بە خودا هەبێت و بڕوا بە تواناکانی خۆت بکە. . . " وەك ووتاری ئایینی قسەکانی دەکرد! بەڵام سەرنجی ڕستەی دووەمی بدە: زۆر سەرنجڕاکێش بوو، دڵ دەهەژێنێت: "دایکم لەساڵی ١٩١٨ دا بێوەژن کەوت و خەرجی سێ منداڵی هەتیوی بەسەردا کەوت..." باشە بۆچی ئەو کەسە لە یەکەم قسەیدا باسی تاڕەحەتییەکانی دایکی نەکرد کە سێ منداڵی هەتیوی بۆ بەجێما؟ بۆ؟ لەبەر ئەوەی گەر بتەوێت قسەکانت لای گوێگر بایەخی هەبێت، ڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش کرۆکی چیرۆك و بەسەرهاتەکەت بڵێ.

## داوا بکە دەستیان بەرز بکەنەوە

یەکێك لە ڕێگا کاریگەر و بەهێزەکان بۆ ئەوەی سەرنجی گوێگر ڕاکێشیت ئەوەیە کە کاتێك پرسیارێك دەکەیت، داوایان لێ بکەیت دەستیان برز بکەنەوە. بە نموونە، من کۆڕێکم هەبوو بەناونیشانی "چۆن خۆمان بپارێزین لە سستی و ماندوێتی." بەم شێوەیە چوومە ناو بابەتەکەوە:

"چەندێکتان هەستدەکەن خێراتر لە ماوەی ئاسایی خۆی ماندوو دەبن؟ با دەستتان ببینم."

سەرنجی ئەم خاڵە بدە: کاتێك داوا دەکەیت دەستیان بەرز بکەنەوە، پێشتر جۆرێك لە ئاگادارکردنەوەیان پێ بدە کە دەتەوێت پرسیارێك بکەیت و ئەوانیش وەڵام بدەنەوە. بەم شێوەیە دەستپێ مەکە: "ئایا چەند کەس پێی وایە دەبێت ڕێژەی باج کەم بکرێتەوە؟ دەست بەرز بکەنەوە" دەرفەتێك بە ئامادەبووان بدە با ئامادەی وەڵامدانەوە بن، بە نموونە: "دەمەوێت پرسیارێکی گرنگ بکەم و ئێوەش بەشداربن. ئەمەش پرسیارەکەیە: چەندێکتان پێتان باشە، یان ئایا چەند کەس لەگەڵ ئەوەدایە...' پرسیارەکەت تەواو بکە"

ئەم تەکنیکە وادەکا زۆرترین گوێگر بەشداری بکات. کاتێك ئەم تەکنیکە بەکاردەهێنیت، قسەکانت یەکلایەنە نابن، بەڵکوو گوێگر و ئامادەبووانیش ئێستا بەشدارن لەگەڵت، بەجۆرێك لە جۆرەکان دەبێتە ووتارێکی دوولایەنە. کاتێك دەڵێیت، "چەندێکتان هەستدەکەن خێراتر لە ماوەی ئاسایی خۆی ماندوو دەبێت؟" هەر یەکێك لەوانەی لەوێدان بیر لە خۆی دەکاتەوە: بیر لە ماندووێتی، ئازارەکانی و هەموو ئەو شتانە دەکاتەوە کە بوون بە کێشە بۆی. ئەنجا دەستی بەرز دەکاتەوە، ئەنجا تەماشای

دەوروبەری دەکات بۆ ئەوەی بزانێت کێیتر دەستی بەرز کردووەتەوە. بیری ئەوەی نامێنێت کە گوێی بۆ ووتارێك گرتووە، تەماشای هاوڕێکەی تەنیشتی دەکات و زەردەخەنەیەك دەکات. ساردی نێوانیان نامێنێت و زیاتر گەرموگوڕ دەبن، تۆ ئاسوودە دەبیت و گوێگرەکانیشت بەهەمان شێوە.

## بەڵێن بە ئامادەبووان بدە پێیان دەڵێیت چۆن ئەو شتەی دەیانەوێت بەدەستی بهێنن

یەکێك لەو ڕێگایانەی کە زۆر بەکەمی شکست دەهێنێت ئەوەیە کە بە گوێگرەکانت بڵێیت: بەئەنجامدانی ئەو شتەی تۆ پێشنیاری دەکەیت بۆیان، ئەوەی دەیانەوێت بەدەستی دەهێنن. مەبەستم لە وتنی ئەم جۆرە قسانەیە:

"دەمەوێت پێتان بڵێم چۆن خۆتان لە شەکەتی و بێهێز بپارێزن. دەمەوێت ئەوەتان پێ بڵێم بتوانن هەموو ڕۆژێك کاتژمێرێك زیاتر بژین."

"دەمەوێت باسی ئەوەتان بۆ بکەم چۆن بتوانن بەشێوەیەکی بەرچاو داهات زیاد بکەن."

"بەڵێن بێت ئەگەر بۆ ماوەی ١٠ خولەك گوێم بۆ بگرن، ڕێگایەکی زۆر سەرکەوتووتان پێ دەڵێم بۆ ئەوەی بتوانن بەناوبانگ بن."

ئەم شێوە بەڵێندان و دەستپێکە بەسەرکەوتوویی سەرنجی بەرانبەر ڕادەکێشێت، لەبەر ئەوەی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەو شتەی کە جێگەی بایەخی گوێگرە. زۆربەی کات قسەکەر و ووتاربێژەکان گرنگی بەوە نادەن بابەتەکەیان ببەستنەوە بە ئارەزووی گوێگرەکانیانەوە. لەبری

ئەوەی دەرگاکانی تامەزرۆیی گوێگر بکەنەوە، بەباسکردنی مێژوویەکی وشك لەسەر ئەو بابەتە دەرگاکان بەتووندی دادەخەن و تام و چێژ لە بابەتکەدا ناهێڵن.

لەبیرمە چەند ساڵێك لەمەو پێش گوێم لە سیمینارێك بوو بەناونیسشانی "بایەخی پشکنینی گشتیی جەستە." ئەم بابەتە خۆی لە خۆیدا گرنگە بۆ گوێگر. دەزانیت کەسی قسەکەر - ووتاربێژ - چۆن دەستیکرد بە قسەکردن؟ ئایا توانی بە سەرەتا و پێشەکییەکی بەهێزەوە بابەتەکەی پڕ بایەخ بکات؟ نەخێر نەیتوانی. دەستیکرد بە باسکردنی پێشینەی ئەو بابەتە و بەشێوەیەکی زۆر بێتام تەنها شتی دەخوێندەوە، گوێگر لە خۆی و بابەتەکەشی بێزار بوون. پێویستبوو بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێشتر دەستپێکی قسەکانی بکردبا. بە نموونە دەیتوانی بەم شێوەیە دەستپێبکات:

ئایا دەتوانیت پێشبینیی ئەوە بکەیت چەنێکی دیکە دەژیت؟ بەشێك هەیە لە کەرتی تەندروستیدا کە دەتوانێت پێشبینیی ئەوەت بۆ بکات: ئەو دەزگایە بۆ ئەو کارەی هەڵدەستێت بە بەکارهێنانی خشتەی پێشبینییەکان، ئەم خشتەیە لێکدانەوە و فایلی ژیانی ملیۆنان کەسە و کۆکراوەتەوە. دەتوانیت پێشبینیی ئەوە بکەیت کە لەو تەمەنەی ئێستاتەوە تا دەگەیت بە ٨٠ ساڵ، دوو بەشی ئەو ڕێژەیە بژیت. بە واتایەکی دیکە، چەند ساڵت ماوە بگەیت بە ٨٠ ساڵ، دوو لەسەر سێی ئەو ماوەیە دەژیت. . . ئایا ئێستا ئەو ماوەی بەدەستەوە ماوتە بەسە بۆ ئەوەی بەدڵی خۆت بژیت؟ نا، نا! ئێمە حەزدەکەین لەوە زیاتر بژین و بیسەلمێنین ئەو پێشبینییە هەڵەیە. پرسیار لە ئامادەبووان بکە: ئایا

چۆن بتوانین ژیانمان لەو ماوەیە درێـژتر بکەینـەوە کـە ئامـار و داتاکـات پێمان دەڵێن؟ بڵێ بۆ ئـەم پرسـیارە وەڵامێـك هەیـە، ڕێگایـەك هەیـە کـە دەتوانیـت ئـەو کێشـەی پـێ چارەسـەر بکـەیت، بۆیـە دەمـەوێت ئـەو ڕێگەیەتان پێ بڵێم. . .

من ئەوە بۆ تۆ بەجێدەهێڵم خۆت بڕیار بدە ئـەو دوو دەسـتپێکە کامیـان زیاتر سەرنجی ئامادەبووان ڕادەکێشێت. بێگومان پێویستە گـوێ لـەوەی دووەم بگریت، لەبەر ئەوەی تـەنها باسـی ژیانـت ناکـات، بـەڵکوو بـەڵێنی داوە شتێکی زۆر بەنرخیشت پێ بڵێ کە پەیوەندی بە کەسێتیتەوە هەیە. ئەم جۆرە پێشەکی و دەستپێکە هیچ کات ناتوانیت خۆتی لێ لابـدەیت و گوێی بۆ نەگریت.

## شتێك بەکاربهێنە

دەکرێت یەکێك لە ئاسـانترین ڕێگاکـان بـۆ ئـەوەی سـەرنجی بەرانبـەر ڕاکێشیت بەرزکردنەوەی کەرەستەیەك بێت بۆ ئـەوەی هـەموان ببیبـنن. ئەو شـتەی بـەکاری دەهێنیـت هەرچییەك بێـت سـوودی هەیـە. تەنانـەت هەندێ جار دەتوانیت لەبەردەم بەڕێزترین و گرنگترین کەسدا شتێك بەکار بهێنیت و کاریگەری و سوودی خۆی هەبێت. بە نموونـە بـەڕێز ئێلـیس لـە فیلەدێلفیا کاتێك لە یەکێك لە وانەکاندا دەستیکرد بە قسـەکردن دراوێکـی بەدەسـتەوە گرتبـوو، تـا ئاسـتی شـانی بـەرزی کردبـووەوە، هـەموان تەماشایان دەکرد. دواتر پرسی: "ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە تا ئێسـتا لـەم دراوەی لە قـەراغ شـەقامەکاندا دۆزیوەتـەوە؟ هـەر کەسـێك لـەم دراوەی

دۆزیبێتـەوە خـەڵاتێکی بـاش دەکرێـت، بـەڵام دەبێـت بێـت و دراوەکـەی پیشانی هەمووان بدات. . . "

هەموو ئەو ڕێگایانەی باسکراون بـاش و بەسـوودن. دەکرێـت بـەجیا جیـا بەکاربهێنرێن، دەشکرێك پێکـەوە کۆبکرێنـەوە و کاریـان لەسـەر بکرێـت. بۆیە ئاگاداری ئەوە بە دەسـتپێکی قسـەکانت بڕیـار دەدات گوێگرەکانـت تۆیان بەدڵە و پەیامەکەت قەبووڵ دەکەن یان نا.

## دووەم/ بەشێوەیەکی ناپەسەند سەرنجی گوێگر ڕامەکێشە

تکـات لێدەکـەم، لـەبیرت بێـت نابێـت تـەنها سـەرنجی گوێگرەکانـت ڕابکێشیت، دەبێـت بەشـێوەیەکی پەسـەند سـەرنجیان ڕاکێشـیت. تکایـە ئاگادار بە گووتم بەشـێوەیەکی پەسـەند. هـیچ کەسـێکی ژیـر کـە دەسـت دەکات بە قسەکردن هەوڵ نادات شتی زبر و نەشیاو بڵێیت، شتێك ناڵێـت پێچـەوانەی گوێگرەکـانی بێـت و بیانکـات بـە دوژمنـی خـۆی و پەیامەکەیشی. کەچی بەداخـەوە لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرێـك لـە ووتاربێـژ و قسەکەران زۆرجار یەکێك لەم هەڵانەی خوارەوە دووبارە دەکەنەوە:

### بە داوای لێبووردن دەست پێمەکە

گەر بەداوای لێبووردنەوە قسەکانت دەسـتپێبکەیت و هـەر لـە سـەرەتاوە پـۆزش بهێنیتـەوە، مانـای وایـە سـەرەتایەکی باشـت نییـە. چـەند جـار گوێمان لێبووە کابرای قسەکەر پۆزشی هێناوەتەوە و داوای لێبووردنی لە ئامادەبووان کردووە کـە بەباشـی خـۆی ئامـادە نـەکردووە. ئەگـەر خـۆت ئامادە نەکردبێت گوێگر خۆی هەستی پێدەکات، پێویستی بەوە نییە تـۆ

بیڵێیت. بۆچی سوکایەتی بە گوێگرەکانت دەکەیت و پێیان دەڵێیت شایەنی ئەوە نین خۆتیان بۆ ئامادە بکەیت؟ دەزانیت، کاتێك دەڵێیت خۆتت ئامادە نەکردووە وەك ئەوە وایە بڵێی خواردنی کۆنە چی ماوەتەوە بۆتان دەهێنم بیخۆن. نا، نامانەوێت گوێمان لە بیانوو و پۆزشهێنانەوە بێت: دەمانەوێت زانیاریمان پێ بدەیت - بایەخمان پێ بدەیت، بۆیە هەمووکات ئەوەت لەبیر بێت: با یەکەم ڕستەی دەستپێکی قسەکانت سەرنجی گوێگر ڕاکێشێت نەك دووەم یان سێیەم ڕستە. یەکە *ڕستە!*

## لە دەستپێکی قسەکانتدا خۆت بپارێزە
## لە باسکردنی شتی پێکەنیناوی

ڕەنگە سەرنجی ئەوەت دابێت ڕێگایەك هەیە بۆ دەستپێکردنی ووتار و قسەکردن بەگشتی، ڕێگەیەك کە کەسی قسەکەر و ووتاربێژ زۆر بەلایانەوە پەسەندە، بەڵام لێرەدا باس نەکراوە! ئەو ڕێگایەش دەسپێکی پێکەنیناوییە. بە هەر هۆکارێك بێت، کەسی نەشارەزا و ساویلکە پێی وایە دەبێت بەباسکردنی گاڵتە و نوکتەیەك قسەکانی بڕازێنێتەوە. پێی وایە چاری چاپلنە. نەکەی بکەویتە ئەو هەڵەیەوە: چونکە دواتر تێدەگەیت ئەو نوکتەی باستکرد جێگەی بەزەییە نەوەك پێکەنین - لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە ئەو نوکتە و چیرۆکە دووبارەبێت و گوێگر بیستبێتی.

ڕەنگە بۆ ئەوەی کەشێکی خۆش بڕەخسێنیت باشتر وابێت چیرۆکێکی ژیانی خۆت باس بکەیت، بەشێوەیەکی پێکەنیناوی باسی ئەو بارودۆخە

بکە کە بەسەرتدا هاتووە. بەوشێوەیە خۆشی و شادی دەخەیتە ناو بابەتەکەوە. جاك بێنی کەسێکی کۆمیدی بوو کە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە قسەی دەکرد. ماوەی چەندین ساڵ ئەم تەکنیکەی بەکاردەهێنا و پەیڕەوی دەکرد. بە باسکردنی خۆی و ڕووداوە پێکەنیناوییەکانی ژیانی خۆی توانی بۆ ماوەی چەندین ساڵ ناوبانگی خۆی بپارێزێت.

گوێگر و بینەر دڵ و مێشکیان بۆ ئەو کەسانە دەکەنەوە کە بەشێوەیەکی کۆمیدی باس لە هەڵە و کەموکورتییەکانی خۆیان دەکەن، بەڵام ئەگەر وەك کەسێکی زۆر پسپۆڕ خۆت پیشان بدەیت و بەشێوەیەك قسە بکەیت کە هەموو وەڵامێك دەزانیت، گوێگر سارد دەبنەوە و قسەت لێ وەرناگرن.

## سێیەم/ پاڵپشتی بیرۆکە سەرەکییەکانت بکە

لە ووتاری درێژدا هەندێك خاڵ هەن دەبێت پەیڕەویان بکەیت: هەتا کەمتر بن باشترە، بەڵام هەموویان پێویستیان بە پاڵپشتە و بەڵگەیە. گەر لەیادت بێت لە بەشی حەوتەمدا باسی ئەوەمان کرد کە بە چیرۆکێکی ژیانی خۆت پاڵپشتی قسەکەت بکەیت. ئەم جۆرە نموونانە زۆر باون بەهۆی ئەوەی دەگات بە ناخی بەرانبەر، وەك دەگووترێت: "هەموو کەسێك حەزی لە چیرۆکە." زۆربەی کات ووتاربێژان چیرۆك و نموونەی جیاواز بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی پاڵپشتی قسەکانیانی پێ بکەن، بەڵام مەرج نییە هەر ئەو ڕێگایە هەبێت بۆ سەلماندنی قسەکانت، شتی دیکەش هەیە لەوانەش: داتا و ئامارەکان، قسەی شارەزایان، لێکچواندن بەکار بهێنیت.

## داتاکان بەکار بهێنە

داتا و ئامارەکان بەکاردێن بۆ خستنەڕووی ڕاستیی و دروستیی ئەو نموونەی باسی دەکەیت. ئەم داتا و زانیاریانە بەئاسانی کاریگەری لەسەر گوێگر دروست دەکەن و قایلی دەکەن، ئەمە لەکاتێکدا کە ڕەنگە نموونەکە بەتەنها ئەوەی پێ نەکرێت. دەکرێت ئامار و داتاکان خوودی خۆیان بێزارکەر بن، لەبەر ئەوە دەبێت بەشێوەیەکی ژیرانە بەکاریان بهێنیت، کاتێکیش بەکاریان دەهێنیت پێویستە بەرگێکی ڕوون ڕەوان بێت بکەیت بە بەریدا.

چەند ساڵێك پێش ئێستا، یەکێك لە قوتابییەکانم لە بروکلین ـ نیونیۆرك باسی ژمارەی ئەو خانووانەی کرد کە ساڵی ڕابردوو بەهۆی ئاگرەوە سووتان. زیاتر دوا و وتی، ئەگەر ئەو خانووە سووتاوانە لەتەنیشت یەکەوە ڕیز بکەین، لە نیویۆرکەوە دەگاتە چیکاگۆ، وە ئەگەر ئەو کەسانەی لەو ئاگرکەوتنەوەدا گیانیان لەدەستدا بەڕیز هەر ٨٠٠ مەترێك یەکێکیان دابنێین، لە چیکاگۆوە دەگەنەوە بە نیویۆرك.

ئەو ژمارانەی باسی کردن یەکسەر لەبیرم چوونەوە، بەڵام ئەوە چەندین ساڵ تێپەڕیووە، بەبێ بیرکردنەوە لەبیرم ماوە خانووە سووتاوەکان لە نیویۆرکەوە تا چکاگۆ درێژ دەبوونەوە.

## قسەی شارەزایان بەکار بهێنە

زوو زوو دەتوانیت بە بەکارهێنانی قسە و ڕای شارەزایان پاڵپشتی ئەو بیرکردنەوە و بۆچوونەت بکەیت کە دەتەوێت بە بەرانبەرەکەتی

بگەیەنیت. پێش ئەوەی قسەی پسپۆڕان بەکاربهێنت، پێویستە تاقی بکەیتەوە و وەڵامی ئەم پسیارانە بداتەوە:

١. ئایا ئەو قسەی من بەکاری دەهێنم ڕاستە؟

٢. ئایا ئەو کەسەی ئەو قسەی کردووە لەو بوارەدا شارەزایە؟ ناکرێت کەسێکی شارەزا لە ئابووریدا، قسە لەسەر لایەنی دەروونی بکات. ئەگەر بیشیکات، پشتی پێ نابەسترێت.

٣. ئایا خاوەنی ئەو قسەی بەکاری دەهێنیت لای گوێگرەکانت ناسراوە؟

٤. ئایا دڵنیایت ئەو قسەیەت لە کەسەکەوە وەرگرتووە و لەسەر بنەمای خۆشەویستی و لایەنگیری ئەو قسەیە ناکەیت؟

لە یەکێك لە خولەکانمدا بەشدابوویەك باسی لەوە دەکرد چۆن لە بواری خۆتدا تایبەتمەندبیت، سەرەتای قسەکانی بە ووتەیەکی ئەندریو کارنگی دەستپێکرد. ئایا باشی کرد و ژیرانە ئەو ووتەیەی هەڵبژارد؟ بەڵێ، لەبەر ئەوەی قسەی کەسێکی بەکارهێنا کە هەموو گوێگرەکان دەیانناسی، کەسێك بوو تەواو شارەزای بازرگانی بوو. ئەو ووتەیە ئێستاش شایەنی دووبارەکردنەوەیە:

بەبڕوای من ڕێگای ڕاستەقینە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن لە هەر بوارێکدا ئەوەیە خۆت لەو بوارەدا تەواو شارەزا بکەیت. من بڕوام بەوە نییە کەسێك هەوڵی هەموو زانیارییەك بدات و بەدوای هەموو بابەتێکی جۆربەجۆردا بڕوات. تا ئێستا نەم بینیوە کەسێك لە بازرگانیدا بەناوبانگ و سەرکەوتوو بێت و لە چەند بوارێکی هەمەچەشندا کاری کردبێت. ئەو

کەسانەی سەرکەوتوون ئەوانەن کە یەك لایەنیان هەڵبژاردووە و پابەندبوون پێوەی.

## لێکچوواندن بەکاربهێنە

بەکارهێنانی لێکچوواندن تەکنیکێکی زۆر باشە بۆ ئەوەی قسەکانت بسەلمێنیت. جیرارد داڤیدسن، جێگری وەزیری ناوخۆ، بابەتێکی لەسەر "پێویستی وزەی کارەبا" پێشکەش کرد، ئەمەش بەشێکە لە قسەکانی. سەرنج بدە چۆن بەراوردکاری دەکات و لێکچوواندن لە قسەکانیدا دەکات بۆ ئەوەی مەبەستەکەی ڕوونتر بکاتەوە:

ئابووری سەرکەوتوو دەبێت بەردەوام لە گەشەدا بێت ئەگەر نا بەرەو دارمان دەچێت. هەمووتان سەرنج بدەن لە بەشی ژێرەوەی فڕۆکە هەندێك پارچەی پێوەیە کە ڕوویان لە خوارەوەیە، بەڵام کاتێك فڕۆکەکە بەرەو پێشەوە دەڕوات، ئەو پارچانە چالاك دەبن و ڕوودەکەنە سەرەوە و کاری تایبەتی خۆیان دەکەن. بۆ ئەوەی ئەو پارچانە ڕوویان لەسەرەوە بێت، پێویستە بەردەام فڕۆکەکە بەرەو پێشەوە بڕوات. ئەگەر بووەستێ، دادەبەزنەوە و ڕوودەکەنەوە خوارەوە — ئەو پارچانە هیچ کات ڕووناکەنەوە دواوە. ئابووریش دەبێت بەردەوام لە گەشەدا بێت ئەگەر نا ڕوو لە خوارەوە و دابەزین دەکات.

نموونەیەکی دیکە هەیە کە ڕەنگە یەکێك بێت لە دیارترین لێکچوواندنەکان لە مێژووی ڕەوانبێژیدا: لە کاتی شەڕی ناوخۆدا و کاتێك بارودۆخەکە تەواو تەشەنەی سەندبوو، لینکن ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ڕەخنە بوویەوە، بۆ

وەڵامی ئەم ڕەخنانە هەستا بە پێشکەشکردنی ووتارێك کە ئەمە نموونەکەیەتی:

بەڕێزان، دەمەوێت تەنها کەمێك لەگەڵم بن. وای دابنێین هەموو ئەوەی هەتانە لە ماڵ و سامان کردووتانە بە زێڕ، هەموو ئەو زێڕەشتان داوە بە کەسێکی تەنافباز (ئەو کەسەی بەسەر حەبل و گوریسدا لە بەرزاییەکەوە دەڕوات بۆ شوێنێکی دیکەی بەرز)، ئەم کەسە دەیەوێت بەناو تاڤگەکانی نیگارادا بڕوات و بپەڕێتەوە. ئایا کاتێك خەریکە بەسەر پەتەکەدا بپەڕێتەوە، تۆ حەبلەکە ڕادەوەشێنیت یان بەردەوام هاواری لێ دەکەیت، "کەمێك خۆت بچەمێنەرەوە، تۆزێ خێراتر بڕۆ!" نەخێر، دڵنیام حەبلەکە ڕاناوەشێنیت. هەناسەت ڕادەگریت و زمانت دەگەزیت و دەستکانت پێکەوە دەنوقێنیت، هەست بە ڕاڕایی و نیگەرانییەکی لەڕادەبەدەر دەکەیت تا بەسەلامەتی دەگاتە ئەوسەری پەتەکە. بەڵێ، ئێستا حکومەت لە هەمان بارودۆخدایە. حکومەت بارێکی قورسی بەسەر شانەوەیە و بەناو زەریایەکدا دەڕوات. چەندین گەنجینەی بەنرخیشی بەدەستەوەیە. زۆر سەر مەخەنە سەری و لۆمەی مەکەن! تەنها کەمێك ئارام بگرن، ئەوکات بە سەلامەتی ئەم دۆخەش تێدەپەڕێنین.

## چوارەم/ داوای جوڵە بکە

ڕۆژێکیان بڕیار وابوو چەند خولەکێك لەگەڵ جۆرج جۆنسن، کە ئەوکات سەرۆکی دامەزراوەی ئێندیکۆت جۆنسن بوو، ووتار پێشکەش بکەین. ئەوەی بەلامەوە زۆر جێگەی سەرنج بوو ئەوەبوو، کە جۆرج جۆرە وتاربێژێك بوو بەئاسانی گوێگرەکانی دەخستە پێکەنین، هەندێ جاریش

دەیهێنانە گریان، لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانی ماوەیەکی زۆرە لە مێشکما ماونەتەوە.

ئەم کەسەی کە ئەوەندەلێهاتوو بوو هیچ ئۆفیسێکی نەبوو، سوچێکی کۆمپانیاکەی تەخانکردبوو بۆ خۆی، ڕەفتاریشی وەك مێزە کۆنەکەی سادە و بێفیز بوو. کاتێك چوم بۆ لای، وتی، "لەکاتێکی باشدا هاتیت، کارێکی بچووکم هەیە پێویستە ئەنجامی بدەم. دەمەوێت هەندێك قسە بۆ کۆتایی ئەو ووتارە ئامادە بکەم کە ئەمشەو پێشکەشی دەکەم."

منیش گووتم، "لەبیرت بێت هەموو کات پێویستە لە سەرەتاوە تا کۆتای بەڕوونی و بەپوختی قسەکانت بکەیت."

وتی، "من بەشێوەیەکی گشتی بیرۆکە و بابەتەکەم ئامادە کردووە و شێوازێکی تایبەتیشم پێیە کۆتایی بە قسەکانم بهێنم."

جۆرج ووتاربێژێکی زۆر کارامە نەبوو. هیچ کات بیری لە وشە نەدەکردەو و بەدوای قسەدا نەدەگەڕا. بەڵام لە ئەزموونەوە یەکێك لە نهێنییەکانی گفتوگۆی سەرکەوتوو فێربووبوو. ئەوەی دەزانی گەر بتەوێت هەموان بایەخ بە قسەکانت بدەن، دەبێت کۆتاییەکی باشت هەبێت. لەوە تێگەشتبوو کە دەرەنجام و کۆتایی ووتار بەشێکی زۆر گرنگە و گەر بتەوێك کاریگەری لەسەر گوێگرەکانت دروست بکەیت، دەبێت لە سەرەتاوە تا دەگەیت بە کۆتایی زۆر بەژیرانە هەنگاو بنێیت.

کۆتایی و دەرەنجام گرنگترین خاڵی ستراتیجی ووتارە، ئەوەی کەسەکە لە کۆتاییدا دەیڵێت لە مێشکی گوێگردا زیاتر دەنگ دەداتەوە و ماوەیەکی زۆرتر لە بیری بەرانبەردا دەمێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ووتاربێژ و قسەکەر بەردەوام هەڵە دەکەن و بەشێوەیەکی شیاو

کۆتایی بە قسەکانیان ناهێنن. ئایا باوترینی ئەو هەڵانە چین کە لەلایەن ووتاربێژانەوە دەکرێت؟ با ئێستا باس لە هەندێکیان بکەین و بەدوای چارەسەردا بگەڕێین.

یەکەم، کەسێك بەم شێوەیە کۆتایی بە قسەکانی دەهێنێت: "ئەمە هەموو ئەوە بوو کە لەسەر ئەم بابەتە بۆم باسکردن، پێویستە لێرەدا بووەستین." ئەنجا بەگشتی کەسەکە بەوتنی "سوپاس بۆ هەموو لایەك" بێتوانایی خۆی لە هەمبەر قایکردنی گوێگرەکانیدا ڕادەگەیەنێت. ئەوە هەڵەیە، بۆنی نەشارەزایی لێ دێت. ئەوە شتێکە جێگەی قەبوڵ نییە. ئەگەر دەتەوێت بە ئامادەبووان بڵێیت تەواو بوویت، پێویست ناکات هیچ بڵێیت، قسەکانت تەواو بکە و خێرا بە شەرمنانە بڕۆ دابنیشە و باسی تەواوبوون و وەستان مەکە. ئەوە باشترە لەوەی بەو شێوەیە قسەکانت کۆتایی پێ بهێنیت.

دووەم، ووتاربێژ یان قسەکەرێك هەیە هەموو ئەوەی پێویستە بیڵێیت دەیڵێت، بەڵام نازانێت چۆن بووەستێت. بەڕای من ئەو کەسە شوێن قسەکەی جۆش بیلینگ کەوتووە کە گووتبووی گا بە کلکی بگرن نەك بە شاخی، لەبەر ئەوەی بەو شێوەیە ئاسانتر دەڕوات. ئەو جۆرە ووتاربێژەش کلکی گاکەی گرتووە و دەشیەوێت بگاتە هاوشانی، بەڵام هەتا زیاتر هەوڵ بدات، گاکە خێراتر دەڕوات و ئەمیش پێی ناگات. لەبەر ئەوە بەردەوام بەدوای گاکەوەیە و دەخولێتەوە، بەهەمان ڕێگەدا دەڕواتەوە، هەمان شت دووبارە دەکاتەوە، کاریگەرییەکی خراپیش لەسەر گوێگر بەجێ دەهێڵێت....

چارەسەر چییە؟ قسەی کۆتایی دەبێت بەرنامەڕێژی بۆ بکرێت، مەگەر وا نییە؟ ئایا کام کات باشترە ئامادەکاری بۆ کۆتایی قسەکانت بکەیت: ئەو کاتەی ڕووبەڕووی گوێگرەکانت دەبیتەوە و سەرقاڵی قسەکردنیت و لەژێر فشاردایت، یان پێشوەخت بەبێدەنگی و بەهێمنی قسەکانت ئامادە بکەیت؟

ئایا چۆن بتوانیت کۆتایی قسەکانت بەتین و کاریگەر بکەیت؟ ئەمانە هەندێك پێشنیارن:

## پوختی بکەرەوە

لە ووتاری درێژدا قسەکەر ئەوەندە شت باس دەکات کە لەکۆتاییدا گوێگر بابەتی سەرەکی قسەکانی بەلاوە ئاڵۆز دەبێت، بەڵام کەم ووتاربێژ هەست بەوە دەکەن. بەوە تێدەکەون وادەزان وەك چۆن ئەو بیرۆکە و بابەتەی باسی دەکەن لای خۆیان ڕوونە، بەهەمان شێوە بەلای گوێگرەکانیشیانەوە ڕوونە. بەهیچ شێوەیەك وا نییە. کەسی قسەکەر ماوەیەکی زۆر بیری لەو شتانە کردووەتەوە کە دەیانڵێت و ئامادەکاری باشی بۆ کردووە، بەڵام هەموو ئەو خاڵانەی باسیان دەکات بەلای ئامادەبووانەوە تازەن، هەر وەك باران دادەبارێت بەسەریاندا. وەك شەیکسپیر دەڵێت گوێگر دەتوانێت کۆمەڵێك شتی لەبیر بێت بەڵام هیچان ڕوون نەبن بەلایەوە.

دگووترێت هەندێك سیاسەتمەدای ئیرلەندی ئەم شێوازەیان بەکارهێناوە: "سەرەتا، پێیان بڵێ دەتەوێت چییان پێ بڵێیت، ئەنجا شەکەیان پێ

بڵێ. دواتر، ئەوەی پێت گووتوون پێیان بڵێرەوە." باشترین شت ئەوەیە، کە "ئەوەی پێت گووتوون پێیان بڵێیتەوە."

## داوا بکە کارێك بکەن

ئێستا لە کۆتا قسەکانتدایت و کاتی ئەوە هاتووە داوای شتێکیان لێ بکەیت، بۆیە داوا بکە! بە گوێگرەکانت بڵێ شتێك بکەن، بە نموونە: بەشداری بکەن، دەنگ بدەن، بنووسن، پەیوەندی بکەن، بیکڕن، بایکۆتی بکەن، ناو تۆمار بکەن، بەدواداچوون بکەن، لێی خۆش بن، یان داوای هەر شتێکی دیکە بکە کە دەتەوێت بیکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وریای ئەم ئاگادارییانە بکە:

*داوایان لێ بە شتکی دیاریکراو بکەن.* مەڵێ، "هاوکاری هەژاران بکەن." نا ئەوە زۆر گشتییە. لەبری ئەوە بڵێ، "هەر یەکێکتان یەك دۆلار بەن بە دەزگای خێرخوازی فلان بۆ بەهاناوەچوونی فلان خێزان."

*داوای شتێکیان لێ بکە کە لەتوانایاندا بێت.* مەڵێ، "با ڕووبەڕووی بەکارهێنانی چەکی نایاسایی ببینەوە." لەوکاتەدا ناتوانن هیچ شتێك بکەن. لەبری ئەوە داوایان لێ بکە لەو ڕێکخراوانەدا بەشداری بکەن کە دژی کارە نایاساییەکانن و هەوڵ بۆ بنەبڕکردنی چەك دەدەن.

*هەتا دەتوانیت ئاسانکاری بۆ ئامادەبوون بکە داواکەت جێبەجێ بکەن.* مەڵێ، "هەمووتا نووسراوێك ئامادە بکات دەیدەین بە سەرۆك وەزیران." ٩٩ لە سەدیان ئەوکارە ناکەن. حەزیان بەو کارە نییە، دەکرێت تووشی کێشە ببنەوە، یان گەر ڕۆشتنەوە هەر لەبیریان نامێنێت. لەبەر ئەوە کارەکە ئاسان بکە. چۆن چۆنی؟ خوودی خۆت نووسراوێك بکە و بڵێ،

"ئێمە، کە لەخوارەوە واژۆمان کردوە، داوات لێ دەکەین ... فلان کار بکەیت." ئەنجا نوسراوەکە و پێنووسێك بدە بە ئامادەبووان بەڕیز واژۆی بکەن، دەبینیت ژمارەیەکی زۆر واژۆی دەکەن - ڕەنگە پێنووسەکەشت تیای نەمێنێت.

## ((بەشی چواردەیەم))

# پیادەکردنی هەموو ئەوەی تا ئێستا فێری بوویت

---

لە بەشەکانی کۆتایی خولەکانمدا بەخۆشحاڵییەوە گوێم لە قوتابییەکانم دەبوو باسی ئەوەیان دەکرد چۆن لە ژیانی ڕۆژانەیاندا تەکنیکەکانی ناو ئەم کتێبەیان بەکارهێناوە و زۆر سوودیان لێ بینیووە. فرۆشیاران ئاماژە بەوە دەکرد ڕێژەی فرۆشیان زیادی کردووە، بەڕێوبەرەکان پلەیان بەرزتر بووەتەوە، خاوەن کۆمپانیاکان دەسەڵاتیان زیاتر بووە، هەمووی بەهۆی پەرەدان بە تواناکانیان و چارەسەرکردنی کێشەکان بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی ناو ئەم کتێبە و هەوڵدان بۆ فێربوونی قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر.

وەك ئەوەی ڕیچارد دیلەر لە ڕۆژنامەی *تودەی سپیچ* نووسیبووی: "قسەکردن، جۆری قسەکردن، بڕی قسەکان، ئەو کەشوهەوایەی قسەکانی تێدا دەکرێت. . . هەموویان هاوشێوەی خوێن بۆ جەستە، گرنگن بۆ قسە و ووتارێکی کاریگەر."

لەکاتی سەرکەوتنمان بە پەیژەکەدا گەیشتین بە هەموو ئەو جۆرە قسانەی لە ووتاردانەوە نزیکن: دەمەتەقێ و وتوێژ، بڕیاردان، چارەسەرکردنی کێشەکان، کۆنفرانسە سیاسییەکان. ئەنجا لەوە تێگەیشتین کە هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا فێریان بوویت، دەکرێت لە قسەی ڕۆژانەدا بەکاربهێنرێن. هەموو ئەو بنەمایانەی باس لە قسەکردن

دەکەن بەشێوەیەکی کاریگەر، ڕاستەوخۆ دەتوانیت لە کۆنفرانسەکاندا بەکاریان بهێنیت یان سەرکردایەتی کۆنفرانسەکانی پێ بکەیت.

ڕێکخستنی بیرۆکەکان، هەڵبژاردنی وشەکان، ئەو پەرۆشی و گەرموگوڕییەی قسەکانی پێ دەکەیت، هەموویان پێکەوە ئەو توخمنەن کە گرەنتی گەیاندنی پەیامەکەت دەکەن. لەم کتێبەدا بەوردی باس لەو توخمانە کراوە، ئەوەکەی دەکەوێتەوە سەر خوێنەر تا چەند پابەند دەبێت پێیانەوە و لەو کۆبوونەوە و کۆنفرانسانەدا بەکاریان دەهێنێت.

دەکرێت بپرسیت و بڵێیت ئاخۆ کەی دەست بکەم بە بەکارهێنانی ئەو بناما و یاسایانەی کە لەو سیانزە بەشەی پێشتردا فێریان بووم. ئەگەر بە یەك وشە وەڵامت بدەمەوە ڕەنگە سەرسام بیت: ئێستا.

ئەگەر بەنیازیش نیت ووتار بدەیت، هەر هەوڵ بدە کاریان لەسەر بکەیت، چونکە ئەوکات تێدەگەین ئەم بنەمایانە هەر بۆ ووتاردان نین، بەڵکوو لە ژیانی ڕۆژانەشدا بەکاردێن و زۆر بەسوودن. کاتێك دەڵێم هەر ئێستا ئەم بنەمایانە بەکار بهێنە، مەبەستم ئەوەیە لەمەوبەدا تووشی هەر جۆرە قسەکردنێك بوویتەوە بەکاریان بهێنە.

لە بەشی حەوتەمدا داوات لێکرا کاتێك قسە بۆ کۆمەڵێك کەس دەکەیت، یەکێك لە چوار مەبەستە سەرەکییەکەی قسەکردن هەڵبژێریت: پێدانی زانیاری، خۆشحاڵکردنیان، بڕواپێهێنانیان بەوەی بۆچوونەکەی تۆ ڕاستە، یان قایلکردنیان بۆ ئەنجامدانی شتێك. ئێمە لە ووتاردانــدا هەوڵدەدەین ئەو مەبەستانە بەڕوونی بهێڵینەوە، هەم لە ناوەڕۆکی بابەتەکەدا و هەم لە شێوازی گەیاندنماندا.

لە قسەی ڕۆژانەدا ئەو مەبەستانە زۆر بەڕوونی دیارن، تا کۆتایی ڕۆژ چەندجارێك مەبەستی قسەکردنەکەمان دەگۆڕین. بەنموونە دەکرێت جارێك لەگەڵ هاوڕێیەکتدا بۆ خۆشی و ڕابواردن قسە و گاڵتەوگەپ بکەیت، دواتر ئاراستەی قسەکانت بگۆڕیت و لە دوکان هەوڵ بدەیت کەسی بەرانبەر قایل بکەیت بەرهەمەکەت بکڕێت. یەکەم جار بۆ خۆشحاڵکردنی بەرانبەر و دواتریش بۆ قایلکردنی قسەکانت بەکارهێنا. بە جێبەجێکردنی ئەو تەکنیکانەی لە کتێبەدا باسکراون لە قسەکردنی ڕۆژانەدا، دەتوانین وا بکەین کاریگەرتر دەرکەوین، بیرکردنەوە و بۆچوونەکانمان باشتر بگەیەنین، هەروەها هانی کەسانی دیکە بدەین.

## یەکەم/ لە گفتوگۆکاندا زانیاری دەقیق بەکار بهێنە

یەکێك لەو تەکنیکانەی لە بەشی چوارەمدا پێم گووتیت ئەوەبوو کە وردەکاری و زانیاری دەقیق لە قسەکانتدا بەکار بهێنیت. پێویستە لەکاتی قسەکردندا ئاگات لەو خاڵە بێت، چونکە بەو شێوەیە بۆچوونەکانت زیندوو دەکەیتەوە و ڕوون و ئاشکرا دەگەن بە بەرانبەر. من تەنها باسی ئەوەم کرد وردەکاری و زانیاری دەقیق بۆ خەڵکانێکی زۆر لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان بەکار بهێنم. بەڵام ئایا ئەم تەکنیکە بۆ گفتوگۆی ڕۆژانەش گرنگ نییە؟ بیرێك لەو کەسانە بکەرەوە کە بەدەم و دوون و قسەزانن. ئایا ئەو کەسانە کاتێك قسە دەکەن، زانیاری جۆربەجۆر بەکارناهێنن؟

پێش ئەوەی دەست بکەیت بە ڕاهێنان و هەوڵدان بۆ ئەوەی توانای گفتوگۆکردنت باشتر بکەیت، دەبێت متمانە و بڕوات بەخۆت بێت. دەتوانیت سوود لە زۆربەی زۆری ئەوەی لە سێ بەشی یەکەمدا باسکراوە

ببینیت و لەگەڵ بنەماکانی دیکەدا تێکەڵیان بکەیت و بەهۆیانەوە بتوانیت لەبەرانبەر کۆمەڵێك کەسدا بۆچوون و بیرکردنەوەکانت بگەیەنیت.

ڕاستە کەمێکمان مۆماستاین، بەڵام هەمووومان کەم تا زۆر زانیاری بە کەسانی دیکە دەدەین و بەشێوەیەك لە شێوەکان دەوری مامۆستا دەگێڕین. وەك دایباب ڕێنمایی و ئامۆژگاری منداڵەکانمان دەکەین، وەك هاوسێ باسی گوڵ و حەوشەیماڵەوە دەکەین، وەك گەشتیار باسی باشترین شوێنە گەشتیارییەکان بۆ یەکتر دەکەین، وەك کڕیار زانیاری لەسەر بەرهەمەکان دەدەین بە کەسێکی دیکە، دەبینیت ڕۆژانە دەکەوینە ئەو جۆرە وتوێژانەوە کە پێویستییان بەوەیە ڕوون بن و قسەکان پەوەندیدار بن پێکەوە و پچڕ پچڕ نەبن. ئەوەی لە بەشی هەشتەمدا وترا سەبارەت بە پێدانی زانیاری بە بەرانبەر، لێرەشدا و لەم جۆرە حاڵەتانەشدا هەمان شتە.

**دووەم/ لە پیشەکەتدا تەکنیکە کاریگەرەکانی قسەکردن بەکار بهێنە**

ئێستا دەچینە باسی جۆرێك لە قسەکردنەوە کە کاریگەری لەسەر پیشەکەمان هەیە. فرۆشیار، بەڕێوبەر، وەزیر، سەرکردە، فەرمانبەر، سەرۆك بەش، مامۆستا، پەرستار، پزیشك، پارێزەر، ژمێریار، و ئەندازیار، هەموو ئەمانە بەرپرسین لەوەی لە بوارەکەی خۆماندا ڕوونکردنەوە بدەین و ڕێنمایی دروست پێشکەش بە بەرانبەر بکەین. هەر ئەم شێوازی ڕێنمایی پێدانەیە دەبێت بە بەڵگە بەدەستی کەسانی سەروو خۆمانەوە بۆ ئەوەی هەڵسەگاندنمان بۆ بکەن و ئایت و توانامان هەڵبسەنگێنن،

لەبەر ئەوە تا دەتوانیت دلە پیشەکەتدا وریا بە و ڕێنمایی و بنەماکانی قسەکردنێکی کاریگەر بەکار بهێنە.

## سێیەم/ بەدوای دەرفتێکدا بگەڕێ قسە بۆ خەڵك بکەیت - ووتارێك پێشکەش بکەیت

سەرەڕای بەکارهێنانی بنەماکانی ئەم کتێبە لە قسەی ڕۆژانەدا، پێویستە بەدوای دەرفەتێکدا بگەڕێیت بتوانیت قسە بۆ ڕای گشتی بکەیت. چۆن ئەمە بکەیت؟ برۆ ناو ڕێکخراوێکەوە کە دەرفەتی قسەکردن بە ئەندمەکانی دەدات. لەوێش ئەندامێکی سست و لاواز مەبە، کەسێکی سەرنجڕاکێش و جیاواز بە. لەگەڵیان بەشداری کارەکان بکە و یارمەتییان بدە. برۆ ببە بە سەرکردەی ئەو ئیشانەی کەس نییە بەڕێوەیان ببات، لەگەڵ کۆمەڵەکەتدا ئیشەکەتان ئەنجام بدەن و تیمێکی چالاك ڕێك بخە. لەوەش گرنگتر: ببە پێشکەشکاری بەرنامە، بەو هۆیەوە دەتوانیت ووتاربێژە زیرەکەکان بانگهێشت بکەیت، دواتر ئەوانیش بۆ ئاهەنگ و کۆبوونەوەکانی خۆیان بانگت دەکەنەوە.

هەوڵ بدە بابەتێك یان ووتارێکی ٢٠ تا ٣٠ خولەکی ئامادە بکەیت. لەو ووتار یان سیمینارەتدا و ڕێنمایەکانی ئەم کتێبە وەك ڕێبەری پێشنیار بەکار بهێنە. با ڕێکخراوەکەت بزانن ئامادەی قسەیان بۆ بکەیت. بە ووتاربێژەکانی ئەو سنورە بڵێ ئامادەی لەگەڵیان بەشداری کۆڕ و کۆبوونەوەکان بیت. چەندین کەمپین هەیە بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن قسەیان بۆ بکات، هەموو کەرەستەو ئامادەکارییەکیشی بۆ دەکەن، کە ئەمەش هاندەرێکی باشە بتوانیت باشتر قسەکانت بکەیت. زۆربەی

ووتاربێژەکان بەو شێوەیە دەستیان پێ کردووە. سام لێڤنسن بە نموونە وەربگرە. سام ئەستێرەی سینەمایی و ووتاربێژێك بوو کە لەسەرتاسەری وڵاتدا گوێی بۆ دەگیرا. پێشتر لە نیویۆرك مامۆستای ئامادەیی بوو. وەك پیشەیەکی لاوەکی دەستیکرد بە قسەکردن لەسەر ئەو بابەتانەی کە شارەزابوو تیایدا، لەوانەش: خێزان، خزم، خوێندکارەکانی، هەروەها لایەنە جیاوازەکانی پیشەی مامۆستایی. ئەو قسانەی وەك ئاگری ناو پووش بڵاو بوونەوە، لەوە بەدواوە داوای لێدەکرا بۆ خەڵکی قسە بکات و بانگهێشتی کۆڕ و کۆبوونەوە گەورەکان دەکرا. ئەوەبوو دواتر لە بواری تەلەفزیۆنیشدا بوو بە کەسێکی ناسراو و بەناوبانگ.

## چوارەم/ دەبێت بەردەوام بیت

کاتێك شتێکی نوێ فێردەبین، وەك زمانی ئینگلیزی، یاری کۆنگفو، یان قسەکردن بۆ خەڵکی، کێشەیەکی گەورەمان هەیە ئەویش ئەوەیە بەردەوام نابین تیایدا. وەك شەپۆل ئیشەکە دەکەین: لەپڕ دەستپێدەکەین و لەپڕ دەوەستین و وازدەهێنین. هەندێ جار بۆ ماوەیەك دەوەستین، ڕەنگە هەر دەستپێنەکەینەوە و ئەوەشی فێری بووین لەبیرمان بچێتەوە. ئەم ماوەی دەوەستیت یان دوادەکەوین لە کاروان، لای هەموو دروونزانەکان ئاشنایە: ئەم دیاردەیە پێی دەوترێت "سڕبوون لە پرۆسەی فێربووندا." ئەو کەسانەی هەوڵی فێربوونی ووتاربێژی و قسەکردن دەدەن جار جار دەوەستن و دووچاری ئەو بارودۆخە دەبنەوە کە ناتوانن گەشە بکەن، ڕەنگە ئەمەش چەند هەفتەیەك بخایەنێت. هەرچەند هەوڵدەدەن ناتوانن گۆڕانکاری لەخۆیاندا بکەن و بەرەوپێش

بچن. ئەوانەی کە لاوازن هەر زوو نائومێد دەبن و وازدەهێنن. ئەوانەشی بەهێزن بەردەوام دەبن، ئەنجا لەپڕ بۆیان دەردەکەوێت و هەست دەکەن پێشکەوتنێکی باشیان بەخۆیانەوە بینیووە. وەك فرۆکە خۆیان لەو قۆناغی سڕبوونە دەرباز دەکەن. لەماوەیەکی کەمدا بەمتمانەوە قسەکانیان دەکەن و لە قسەکردندا کاریگەر و سروشتی دەردەکەون و دەبنە ئەو کەسەی هەوڵیان بۆ دەدا.

وەك ئەوەی لە چەند شوێنێکی دیکەدا ئاماژەی پێدرا، ڕەنگە سەرەتا کە ڕووبەڕووی گوێگر دەبیتەوە و دەبینیت هەندێك کەس بەدیار تۆوە دنیشتوون، هەست بە ترسێك، ڕاڕایی، یان نیگەرانییەك بکەیت. تەنانەت کەسە زۆر بەناوبانگەکانیش کەمێك هەست بە ترس و ڕاڕایی دەکەن. ئەگەر بەردەوام بیت و کۆڵ نەدەیت، هەموو ئەو هەستە نەرێنیانە ڕیشەکێش دەکەیت و زاڵ دەبیت بەسەریاندا، تەنانەت ئەو ترسە کەمەش ناهێڵێت کە لەسەرەتادا بۆ هەموو کەسێك دروست دەبێت. کە وازت نەهێنا و بەردەوام بوویت، دواتر لەکاتی قسەکردندا و دوای چەند ڕستەیەکی سەرەتا، دەبینیت تەواو موسەیتەریت و بەشێوەیەکی سروشتی قسە دەکەیت.

جارێکیان گەنجێك داوای ئامۆژکاری لە لینکن کرد و پێی وت زۆر حەزدەکات ببێت بە پارێزەر. لینکن بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە، "ئەگەر خۆت یەکلایی کردووەتەوە ببیت بە پارێزەر، ئەوە نیوەی ڕێگاکەت بڕیووە. . . . هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت بڕیاردان و یەکلابوونەوە بۆ سەرکەوتن لە هەموو شتێك گرنگترە."

لینکن ئەوەی باش دەزانی، بە هەموو ئەو شتانەدا پێپەڕیبوو. هەموو ژیانی کۆبکەیتەوە هێندەی یەك ساڵی قوتابخانەی هەوڵی نەداوە و ماندوو نەبووە. لەبارەی کتێب خوێندنەوە چی؟ جارێکیان لینکن وتی: بە دووری ٦٠ کیلۆمەتر دەروبەری خۆی گەڕاوە و هەموو ئەو کتێبانەی بە قەرز هێناوە کە لەو سنوورەدا دەستی کەوتووە. هەموو جارێك ئاگرێك لە نزیك ئەو کابینەی ئەو لێ دەژیا دەگڕا، لە درزی کابینەکەیەوە ڕووناکی دەهاتە ژوورەوە، ئەویش لەوێدا دادەنیشت و کتێبی دەخوێندەوە. بەیانیان هەر کە دونیا ڕووناك دەبوویەوە، لەسەر جێگاکەی تەپاوتلێکی دەدا و چاوی دەسڕی و کتێبەکەی دەردەهێنا و دەیخوێندەوە.
٢٠ تا ٣٠ کیلۆمەتر بە پێ دەڕۆشت گوێی لە ووتارێك دەگرت و دەگەڕایەوە ماڵەوە. لە هەموو شوێنێك ڕاهینانی لەسەر قسەکانی دەکرد ــ لە سەر کارەکەی، لە پارك و شوێنە گشتییەکاندا، لە بەرچاوی خەڵکیدا. بەشداری دیبەیت و گفتوگۆکانی دەکرد. ڕاهێنانی لەسەر ئەو بابەتانە دەکرد کە باس و خواستی گەرمی ڕۆژ بوون. لینکن زۆر شەرمی لە ئافرەتان دەکرد: کاتێك لەگەڵ ماری تۆد، کە دواتر بوو بە هاوسەری، یەکیان دەبینیی، بەشەرمەوە لە سوچێکدا بێدەنگ و شەرمن دادەنیشت، نەیدەتوانی یەك وشە بڵێت، تەنها گوێی دەگرت. کەچی بوو بەو پیاوەی بەهۆی ئەوەی بە متمانەوە ڕاهێنانی دەکرد و لە ماڵەوە هەوڵی دەدا، وای لێهات لەگەڵ گەورەترین ووتاربێژ و قسەکەری سەردەمی خۆیدا دیبەیتی دەکرد ـ سیناتۆر ستیفن دۆگلاس.

لە کۆشکی سپی لە ژوری سەرۆك کۆماردا وێنەیەکی لینکن هەڵواسراوە. سیۆدەر ڕۆزەڤێڵت، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکا، دەڵێت، "هەر جارێك کە کێشەیەکم تووشدەبێت و دەبێت بڕیاری لەسەر بدەم، شتێك بێت قورسبێت و نەتوانم چارەسەری بکەم، شتێك کە کێشە و ململانێی لەدواوە بێت، تەماشایەکی لینکن دەکەم و هەوڵدەدەم ئەو بهێنمە جێگەی خۆم، بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر ئەو لەم جێگەی من بووایە چی دەکرد. ڕەنگە بەلاتەوە سەیر بێت، بەڵام ڕاشکاوانە بڵێم بەو شێوەیە کارەکانم ئاسانتر دەبێت."

**پێنجەم/ دڵنیا بە لەوەی دەستکەوتت دەبێت**

ئای خۆزگە هەموو بەیانییەك کە نان دەخۆیت ئەم کتێبەت لەبەردەمی خۆتدا دابنایە تا ئەو کاتەی ئەم وشانەی پرۆفیسۆر ویلیام جەیمست بەجوانی لەبەر دەکرد:

با هیچ گەنجێك نیگەرانی داهاتووی خوێندنەکەی نەبێت، گرنگ نییە لە چی بەشێکدا دەخوێنێت. ئەگەر بە متمانەوە خۆی سەرقاڵی خوێندنەکەی بکات و هەوڵی تەواوەتی بدات، ئەوکات دەرەنجامەکەی دەبینێت. با دڵنیابێت لەوەی ڕۆژێك دادێت لەو بوارەی خۆیدا دەبێت بە یەکێك لە کەسە کارامەکانی سەردەمی خۆی.

کەواتە لەسەر قسەکەی پرۆفیسۆر جەیمس، دەتوانم بڵێم، گەر بەشێوەیەکی دروست بەردەوام بیت لە مەشق و ڕاهێنان، ڕۆژێك دادێ دەبیت بە یەکێك لە ووتاربێژ و قسەکەرە کارامە و چالاکەکانی ئەو شارە یان ئەو ناوچەیەی خۆت. ڕەنگە شتکەت زۆر بەلاوە سەیر بێت، بەڵام ئەوە ڕاستییە و بنەمایەکی گشتییە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك حاڵەتی

شازمان هەیە. کەسێك بیرکردنەوە و کەسایەتییەکی لاوازی هەبێت و هیچ شتێك نەبێت قسەی لەسەر بکات، بێگومان بەپێی پێویست گەشە ناکات.

من خۆم هەزاران کەسم بینیووە هەوڵیان داوە بڕوابەخۆبوون و متمانە بە خۆیان پەیدا بکەن و بتوانن قسە بۆ خەڵك بکەن. هەموو ئەوانەی لەو هەوڵەدا سەرکەوتوو بوون، تەنها چەند کەسێکی کەمیان نەبێت، کەسانی ئاسایی و پیشەوەر بوون کە لە کۆڵانەکەی ئێوەشدا لەو کەسانەی تێدایە، بەڵام تەنها هۆکار ئەوەبوو بەردەوام بوون و کۆڵیان نەدا. هەندێکیان جار جار سارد دەبوونەوە یان خەریکی پارەپەیداکردن بوون و بەپێی پێویست گرنگیان بە ئامانجەکەیان نەدەدا، لەبەر ئەوە زۆر بەردەوام نەبوون، بەڵام ئەوانی دیکە کە دانیان بەخۆدا گرت و تەنها ئەو ئامانجەیان هەبوو، لەکۆتایدا هەر ئەوانە بوون گەشتنە لوتکە.

ئەوە سروشتی مرۆڤە بەو شێوەیە. ئایا نابینیت هەمان شت بەردەوام لە بازرگانی و پیشەدا دووبارە دەبێتەوە؟ دکتۆر جۆن ڕۆکفێلەر دەڵێت: یەکەم بنەما بۆ سەرکەوتن لە پیشەکەتدا ئەوەیە کە ئارام بگریت و دڵنیابیت دەسکەوتت دەبێت. ئەمەش بەهەمان شێوە یەکەم بنەمایە بۆ ووتاربێژی و قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر.

ڕێژەی سەرکەوتنت پەیوەستە بیرکردنەوەی خۆتەوە سەبارەت بە توانای قسەکردنت. چۆن بیر بکەیتەوە بەو شێوەیە دەبێت. بەو شێوەیە خەیاڵ بکە لەبەرانبەر ئەو خەڵکەدا وەستاویت و بەوپەڕی متمانەوە قسە دەکەیت. ئەمە لە ڕاستیشدا زۆر ئاسانە و دەتوانیت ئەنجامی بدەیت. بڕوات وابێت کە سەرکەوتوو دەبیت، بڕوایەکی تۆکمە، ئەوکات ئەوەی پێویست بێت بۆ سەرکەوتن ئەنجامی دەدەیت.

یـەکێك لـەو شـتە بەنرخانـەی کـە بەشـداربووان لـە ڕاهێنـان و خولەکانمانـدا بەدەسـتیان دەهێنـا متمانـە بـەخۆبوون بـوو، متمانـە بـە تواناکانیان و بەوەی کـە دەتـوانن سـەرکەوتوو بـن. ئایا چـی شـتێك زۆر گرنگە بۆ ئـەوەی لـە هـەر پرۆژەیەکدا سـەرکەوتووبیت؟ ئیمێرسـن وەڵام دەداتەوە: "هـیچ شـتێك بـەبێ پەرۆشـی بەدەست نایـەت." ئـەوە زۆر لـە وشـەیەکی ئاسـایی زیـاترە: ئـەوە نەخشـە ڕێگەیەکـە دەتبـات بـەرەو سەرکەوتن.

ویلیام لیۆن فێلپس یەکێك بوو لە خۆشەویسـترین پرۆفیسـۆرەکانی زانکـۆ یـەیڵ. لـە کتێبەکەیـدا، "خۆشـییەکانی وانـە وتنـەوە،" دەڵێـت: "بەنیسبەت منـەوە، وانەوتنـەوە لـە هونـەرێك یـان لـە پیشـەیەك زیـاترە. وانەوتنــەوە حــەزە. وەك چــۆن وێنەکێشــێك حــەزی لــە وێنەکێشــانە، گۆرانیبێژێك لە گۆرانی وتن، شاعیرێك لە نووسـین، منـیش ئـاوا حـەزم لـە وانەوتنەوە و فێرکردنە. بەیانیان کە بەخەبەر دێم و خۆم ئامادە دەکـەم، بیرم لای قوتابییەکانمە."

ئایا گەر کەرێکی ئاوا بتوانێـت سـەرکەوتوو بێـت جێگـەی پرسـیار و سەرسوڕمانە، مامۆستایەك ئەوەندە تامەزرۆ و پەرۆشی کارەکـەی بێـت و ئەوەنـدە گـەرموگوڕ بێـت لـە پیشـەکەیدا، نابێـت سـەرکەوتوو بێـت؟ بێگومان. پرۆفیسۆر ویلیام کاریگەرییەکی گەورەی لەسـەر قوتابییـەکانی هـەبوو، هەمووشـی بـەهۆی ئـەو خۆشەویسـتی و تامەزرۆییـە بـوو کـە بـۆ کارەکـەی هـەیبوو. ئەگـەر بەپەرۆشـی و خۆشەویسـتییەوە هـەوڵی ئـەوە بدەیت فێری قسەکردن و ووتاربێژی بیت، دەبینیت بەربەستەکانی ڕێگەت خۆیان نامێنن.

بهێنە پێش چاوی خۆت کەسێکیت توانای بڕیاردانت هەیە، کەسێکی هاوسەنگ و خاوەن متمانەیت، بیر لەوە بکەرەوە سەرنجی ئەو خەڵکەت بەلای خۆتدا ڕاکێشاوە و هەمووان ئاڕاستە دەکەیت، هەستیان دەجوڵێنیت، قەناعەتیان پێ دەکەیت کارێك بکەن. ئەوکاتە تێدەگەیت کارامەیی و سەرکەوتن لە قسەکردندا دەتبات بەرەو سەرکەوتن لە بوارەکانی دیکەدا، چونکە ڕاهێنان و مەشقکردن بۆ ووتاربێژی و قسەکردن بۆ خەڵك ڕێگایەکی نموونەییە دەتگەیەنێت بە سەرکەوتن لە هەموو بوارەکانی دیکەدا.

## پوختەی بەندی پێنجەم

**ئاستەنگەکانی ووتاردان و قسەکردن بەشێوەیەکی کاریگەر**

### بەشی دوانزەیەم: ناساندنی ووتاربێژانی دیکە، پێشکەشکردن و وەرگرتنی دیاری و بەخشش

یەکەم/ ئەوەی دەتەوێت بیلێیت بەوردی ئامادەی بکە

دووەم/ شوێن ڕێسای نـ - گـ - قـ بکەوە

سێیەم/ بەپەرۆش بە

چوارەم/ زۆر گەرموگوڕ و دڵسۆز بە

پێنجەم/ بەوردی ئەو قسانە ئامادە بکە کە لە ناساندن و دەستپێکدا دەیانلێیت

شەشەم/ کاتێك خەڵات وەردەگریت، هەستی سوپاسگوزاریت دەربڕە

### بەشی سیانزەیەم: ئامادەکردنی ووتاری دووروودرێژ

یەکەم/ دەستەبجێ سەرنجی گوێگر بۆ خۆت ڕابکێشە

به نموونەیەکی واقیعی دەست پێ بکە

گوێگر تامەزرۆی ڕووداوەکانی دواتر بکە

زانیارییەکی سەرنجڕاکێش بڵێ

داوا بکە دەستیان بەرز بکەنەوە

بەڵێن بە ئامادەبووان بدە پێیان دەڵێیت چۆن ئەو شتەی دەیانەوێت بەدەستی بهێنن

شتێك بەکاربهێنە

دووەم/ بەشێوەیەکی ناپەسەند سەرنجی گوێگر ڕامەکێشە

به داوای لێبووردن دەست پێ مەکە

لە دەستپێکی قسەکانتدا خۆت بپارێزە لە باسکردنی شتی پێکەنیناوی

سێیەم/ پاڵپشتی بیرۆکە سەرەکییەکانت بکە

داتاکان بەکار بهێنە

قسەی شارەزایان بەکار بهێنە

لێکچوواندن بەکاربهێنە

چوارەم/ داوای جوڵە بکە

پوختی بکەرەوە

داوا بکە کارێك بکەن

**بەشی چواردەیەم: پیادەکردنی هەموو ئەوەی تا ئێستا فێری بوویت**

یەکەم/ لە گفتوگۆکاندا زانیاری دەقیق بەکار بهێنە

دووەم/ لە پیشەکەتدا تەکنیکە کاریگەرەکانی قسەکردن بەکار بهێنە

سێیەم/ بەدوای دەرفتێکدا بگەڕێ قسە بۆ خەڵك بکەیت ـ ووتارێك پێشکەش بکەیت

چوارەم/ دەبێت بەردەوام بیت

پێنجەم/ دڵنیا بە لەوەی دەستکەوتت دەبێت

"هەموو کار و چالاکییەکی ڕۆژانە جۆرێکە لە پەیوەندی و ئاخاوتن، بەڵام تەنها بەهۆی قسەکردنەوە مرۆڤ دەتوانێت گوزارشت لە ناخی خۆی بکات. تەنها مرۆڤە لەناو هەموو بوونەوەرانی دیکەدا ئەو بەخششەی پێدراوە و دەتوانێت گفتوگۆی زارەکی بکات، هەروەها بەهۆی تایبەتمەندیی قسەکانییەوە دەتوانێت کەسایەتی و ناخی خۆی دەربخات. بۆیە کاتێك ئەم کەسە ناتوانێت ئەوەی مەبەستێتی بەڕوونی بیڵێت، دەبینیت کەسایەتیی و ناخی بەداخراوی دەمێننەوە و گوێگر ناتوانێت بەباشی لێی تێبگات. کاتێك کەسێك دەتوانێت بەڕوونی گفتوگۆ بکات و قسە بۆ هاوڕێ و هاوپیشەکانی بکات، باس لەوە بکات حەزی لە چییە و بڕوای بە چییە، ئەوکات هەست بە ئاسوودەیی و متمانەبەخۆبوون دەکات"










4000 IQD